ENDÊŞE
ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە



# هیچ

## دانپێدانانەکانی دایکێک

کۆچەر ئەبوبەکر




تاکە پەیجی فەرمی لە فەیسبووک
کتێبیPDF
www.fb.com/PDFkurd

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ENDESE
ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

ناوی کتێب: هیچ
ناوی نووسەر: کۆچەر ئەبوبەکر
بابەت: نامە
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٥
چاپخانە: پەنجەرە
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نرخ: (٥٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١١٨٩)ـی ساڵی (٢٠١٥)ـی پێ دراوە.



ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org●andesha.library@yahoo.com
http://www.facebook.com/Andeshacenter

ئەم نامەیە:

- بـۆ هەمـوو ئـەو (ڕامین)انەیـە، کـە لـەم ئەسـتێرەیەدان و هەمـوو ئەوانەشـی لێـرە نیـن، بـەڵام ڕۆژێـك لـە ڕۆژان سـەرێك لـەم هەسـارەیە دەدەن.

- بـۆ داسـتان بـەرزان، کـە هەسـت دەکـەم لـە منداڵدانـی منـدا دروسـت بـووە، منداڵێکـە گـەورە نابێـت.

ئـەم دێڕانـە پەیامـی دڵـی شـکاوی دایکێکـن، کـە لەسـووچێکی تۆپـە خڕەکـەدا کەوتـووە و دەستی خستـۆتەوە نـاو خـۆی و بـۆ ئێـوە دەگەڕێـت، وەك ئـەوەی دوو دەنـك مـووڕووی لـێ ون بووبێـت.

زایەڵـەی دەنگـی نووسـاوی دایکێکـە، کـە خەریکـە دووکەڵـی ژیـان دەیخنکێـت.

به ناوی تۆی گەورە و میهرەبان

به ناوی مریەم  و هەموو ئەو دایکانەی لە مەسیح  و ڕامینەکانیان دوورن و

بۆشاییی گەورەی ناوەوەیان هەرگیز پڕ نابێتەوە.

# نامەیەك بۆ ڕامین

لە دوورترین زەمەن و لە دوورترین مەوداوە، سڵاو لە تۆ، ئازیزترینم...

کەرویشکە بچکۆلەکەم...

دڵنیام لە کاتێکدا من ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنووسم، تۆش خەریکی هەمان شتی بۆ من، پاش تەواوبوونی نووسراوەکەت، دەیکەیت بە تەیارەیەکی منداڵانە و دوور هەڵی دەدەیت. پێت وایە خودا لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە دەیخاتە ئەمدیو دیواری دڵم، یاخود لەمدیوی پەنجەرەیەکەوە هەڵدەلەرزیت، سەرمای ژیان تەزاندووتی، تەماشای باران و هەورەبروسکە دەکەیت، ئەو پرسیارگەلەی جاران لە منت دەکرد دەربارەی سروشت و کۆی شتەکان، ئێستا لە نەبوونیی مندا لە خۆتی دەکەیت، ناچاریشی بەدوای وەڵامدا بگەڕێیت.

یاخود وەکوو دایکت سەرکێشیت و لە سەربانێکدا بیر لە فڕین دەکەیتەوە، لەیادت نییە ئەمشەو یادی لەدایکبوونتە. ئێستا ئیدی کەسێک نییە ئەو شەوە بڕازێنێتەوە. ئێستا ئیدی کەسێک نییە بیر لە مەراسیم و کوژاندنەوەی مۆم لەسەر کێک بکاتەوە.

خۆ منیش هیچم پێ ناکرێت، جگە لەوەی وەک دەیان شەوی دی، کە لە دووری ئێوە بە گریانەوە بەسەرم بردووە و نەمتوانیوە بنووم، ئەمشەویش هەمان شت دەکەم. دەستم بە نووسینی ئەم نامەیە کردووە،

ڕەنگە درێژەی هەبێ و ڕەنگیشە وەک هەموو کارە تەواونەکراوەکانی دی، بە تەواونەکراوی جێی بهێڵم.

لە کاتی نووسینی ئەم نامەیەمدا بۆ تۆ، تۆ تەمەنت شەش ساڵە، تەنیا دوو کاتژمێری دی شەش ساڵی بەجێ دەهێڵیت و دەچیتە حەوت ساڵییەوە، بەڵام نازانم لە کاتی خوێندنەوەی ئەم نووسراوەدا، تۆ تەمەنت چەند دەبێت؟ لەکوێ دەژیت و چەند سانتیم زیادت کردووە؟ بە چەند کیلۆوە قورساییت هەیە لەسەر زەوی؟ سەر بە چ ئایینێکیت و چ خودایەک دەپەرستی، ڕەنگە نووسەر بیت یان باوک، کێ دەزانێت.

ئەگەر لە من بپرسیت حەز دەکەم لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا بیخوێنیتەوە، بەڵام ڕەنگە تۆ زووتر ئەوە بکەیت، یان هەرگیز مەیلی خوێندنەوەیت نەبێت. لە هەر حاڵێکدا، من ئاسوودەم، چونکە گریمانەی ئەوە هەیە، چەندین ڕامینی دی هەبن بیانەوێت لە زمانی دایکێکی دوورخراوە لە منداڵەکانی تێبگەن و هەستەکانی بخوێننەوە. بە هەرحاڵ، ئەگەر بڕیارت دا بیخوێنیتەوە، ئومێدەوارم لە دێڕبەدێڕی ئەم نووسراوە تێبگەیت.

نا، ببورە، خواستی من لەوە زیاترە، دەمەوێت لە مەبەست و واتای پشتی دێڕەکانیش بگەیت، تەنانەت هەست بەو دێڕانەش بکەیت، کە نەمنووسیون.

هەوڵ دەدەم بە زمانێکی سادە ئەم نووسراوە بنووسم، چونکە گریمانەی ئەوە هەیە، تۆ زۆر بە منداڵی بیخوێنیتەوە. نایشمەوێت بە ئامۆژگاریی زۆر پڕی بکەمەوە. ئەم نووسراوە تەنیا وڕێنەیەکی کورتی منە، تەنیا خۆ-خاڵی-کردنەوەیەکی بچووکە، لە ساتێکدا بۆت پڕ بووم و حەزم کردووە چەند وشەیەکت بۆ بنووسم.

ئەگەر بڕیارت داوە بیخوێنیتەوە، کەواتە لێرەدا بوەستە... داواکاریەکم هەیە، ئەگەر شەو نییە، چاوەڕوانی هاتنی شەو ب

هەڵهاتنی مانگ بکە، ئەوکات بچۆرە سەربانەکەی ماڵی نەنکت.

ئۆووو... ڕەنگە ئێستا (مەبەستم لە ئیستای داهاتووە، ئەو ساتەی تۆ ئەم نووسراوە دەخوێنیتەوە و سێبەرەکەت درێژتر بووە) ماڵی نەنکت لە هەمان خانوودا نەبن، یاخود لە کاتی خوێندنەوەی ئەم نامەیەدا، مانگ دەمێک بێت دەر نەکەوتبێ و وا زوویش دەر نەکەوێت... کێ دەزانێت؟ هەرچۆنێک بێت، داوات لێ دەکەم چاوەڕوانی هەڵهاتنی مانگ بکەیت.

بوەستە... لە خوێندنەوە بوەستە و ئەوە بکە.

# ١

ئێستا مانگەشەوە؟ لە سەربانی ماڵی نەنکتی؟ نازانم تۆ چ وەڵامێکت دەبێت، بەڵام چاوەڕوانیش نیم دڵم بشکێنی، چونکە تۆ هەرگیز ئەوەت نەکردووە.

بەڕاست، ئێستا چ وەرزێکە؟ لای من زستانە، زستانێکی سارد و وشک، زستانێک، کە سەرماکەی وەکوو گوێزان لەشی مرۆڤ دەبڕێت، لەلای تۆیش هەر وایە؟ ئەگەر زستانە، دڵنیام بکەرەوە لەوەی جلی گەرمت لەبەردایە و کڵاوێکیشت لەسەر کردووە، ئەگەر هاوینیشە، هەوڵ مەدە بە قۆڵ و قاچی ڕووتەوە دابنیشیت، چونکە سەربانی ماڵی باپیرت هەمیشە مێشوولەی هەیە و دڵنیام ئەوانیش وەکوو من تامەزرۆن بۆ ماچکردنی تۆ، ئەگەریش پاییز یان بەهارە، خۆت سەرپشک بە.

ڕامین، دەتوانیت ئەو شەوانە بەبیر خۆت بهێنیتەوە، کە من و تۆ لەم سەربانەدا سەیری ئاسمانمان دەکرد و چەندان باس و خواسمان دەورووژاند؟ ئەڵبەت شەوانی هاوین. بەبیرت دێت من باسی منداڵیی خۆمم بۆ دەکردیت؟ کە هەمیشە چوومەتە سەر بانی ماڵی خۆمان و دارێکم بە دەستەوە گرتووە و قاچە بچکۆلەکانم بەرز کردوونەتەوە، ویستومە دارەکەم بگاتە ئاسمان، تا ئەستێرەیەک لێبکەمەوە؟ چەندین

جار گریاوم، کە نەمتوانیوە ئەوە بکەم. تۆیش بەو دەنگە پێغەمبەرانەیەی خۆتەوە، منداڵانە بە گێلیەتی دایکت قاقا پێدەکەنیت و بە پشتدا دەکەوتی. هیچت بیر هاتەوە؟ چاوەکانت دابخە، بەهێمنی چاوەکانت دابخە، هەست بەو کاتە بکە و بیر بکەرەوە...

شەوێکیان داوات لێ کردم ئەستێرەکان بکوژێنمەوە، تا دونیا تاریک دابێت و کەس نەتبینێ . ڕووت کردە مانگ و میزت بە گوڵەکانی باخچەکەدا کرد. ئەمجارەیان من بە تۆ پێکەنیم، چونکە پێت وا بوو ئەگەر ئەستێرەکان بکوژێنمەوە، ئیدی ڕووناکی نامێنێت، بەڵام ڕووناکیی مانگ دونیای ئەدرەوشاندەوە، وەک چۆن ئێستا من ڕووناکیی تۆ دەبینم، دونیای منی ڕۆشن کردۆتەوە. ئەمەم خستە شیعرێکەوە، هەرکاتێک دەمخوێندەوە، تۆ برۆکانت لە یەکتر نزیک دەکردنەوە و لێوەکانت چکۆلە دەکردنەوە و بۆ سەرەوە دەتبردن، دەتویست پێم بڵێیت من تووڕەم، چونکە تۆ باسی قنی ڕووتی منت بۆ دونیا کردووە. ئێستایش کە دووبارە لێرەدا باسم کردەوە، هەمان هەستت هەیە؟ دیسان لێم تووڕەیت؟

هەندێک جار پێم دەوتیت بە منداڵی حەزم کردووە بفڕم و هەمیشە ویستومە لە سەربانێکەوە خۆم هەڵبدەم و نەموێراوە. جارێکیان ئەو عەبا چکۆلەیەی نەنکم بۆی دروست کردبووم، کردبوومە قۆڵەکانم و لەسەر دیوارێکەوە خۆم هەڵداوە، قاچەکانم ئازاریان پێ گەیشتووە، بە جۆرێک، چەند ڕۆژێک نەمتوانیوە بچم بۆ قوتابخانە. ئەوسا پێم دەوتیت تۆ هەرگیز ئەوە نەکەیت، هەرگیز بیر لە فڕین نەکەیتەوە، بەڵام دواجار دایکت فڕی، ئێستاش هەوڵ دەدات بەرزتر بفڕێت. لە داواکارییەکانی ئەوسام پاشگەز دەبمەوە، هەرکات ویستت بفڕێت، بفڕە بۆ بەرزترین ئاسمان، ترست لە ئازاردانی قاچەکانت نەبێت. متمانەت بە باڵەکانت هەبێت.

بەڕاست، تۆیش هێندەی دایکت عاشقی مانگیت؟ باوەڕ ناکەم، بەڵام چاوەڕوانم لانی کەم ئەوت خۆش بوێت. عەشقی من بۆمانگ، عەشقێکە لەوەدا دەیبینمەوە، کە مانگ دوورەدەستە. هەمیشە ڕووناکییەکان لە دوورەوە جوانن، ڕەنگە بەنزیکبوونەوە لێیان، ئەو هەستەمان بۆیان نەمێنێ، یان ڕەنگە ئەوان ئەو ڕووناکییەیان نەمێنێ.

چەند مانگێک بەر لە ئێستا چووبوومە سەر تانکیی سەربانەکەی ماڵی نەنکم، بەو مەبەستەی نزیکتر ببمەوە لە مانگ. ئەمە خولیامە و هەتا مردن وەکوو کرم لە مێشکمدا دەجووڵێتەوە. ئەوانەی لە دەوروبەرمن، پێیان وایە من خووەکانی منداڵیم تەرک نەکردووە، نەنکم دەڵێت:

«تۆ هەر منداڵیت و چەند سەدەیەکت پێویستە بۆ گەورەبوون.»

جارێکیان لەگەڵ باوکتدا بە کۆڵانێکدا تێپەڕین، پاشماوەی خەتخەتێنی منداڵانی تێدا جێ مابوو، پڕبەدڵ هەڵبەزیمەوە و خەتخەتێنم کرد، باوکت شەرم گرتی و دۆعای دەکرد کەس نەمبینێ.

هیچ شتێک بەلای منەوە مەحاڵ نییە، شتێک کە ئارەزووم لێی بێت، هەرچەندە لە نەبوونی دڵنیا بم، هەر هەوڵی بۆ دەدەم. نەنکت پێی وایە من ئینکارترین مرۆڤم، بەڵام من ناوی نانێم ئینکاری، بەڵکوو ئەوەی بمەوێت بیکەم، پێویستە لە چەند هەنگاوێک زیاتری بۆ بنێم، ئەگەر لەو هەنگاوانەدا بشکەوم، کێشە نییە. ئومێدەوارم لەمەدا بچیتەوە سەر دایکت.

بەڕاست، تۆ دایکت دەناسیت؟

ئاشنای ئەم مرۆڤە هەیت؟ باوەڕم وایە ئاشنام بوویت، نەک هەیت. زیاتر لە هەرکەس منت دەناسی و زیاتر لە هەرکەس لێم نزیک بوویت، بەڵام ئەوە عەیامێک بوو گوزەشت و بوو بە ڕابردوو. ئێستا تۆ گەورە بوویت و ئەو سەردەمەش زۆر دوور کەوتۆتەوە، وەک چۆن تۆ لە

دەیانناسم، نەک کەسانەی ئەو منداڵیت دوور کەووتویتەوە.

بە بڕوای باوکت و باوکم و زۆربەی ئەو کەسانەی من هەرکاتەی دەمناسن، تێگەیشتن لە من قورسە. یانی پێیان وایە من جۆرێکم، تا ئیستا هیچکەس نەبووە بەتەواوەتی من بناسێت. لات سەیر نەبێت، چونکە من خۆیشم خۆم ناناسم، بەڵام ڕەنگە تۆ بتوانیت ئەوە بکەیت و جێگەیەک هەبێت، تۆ تێیدا من بناسیت. تەنیا شتێک بزانە، لە دیدی هیچ کەسێکەوە لە کەس مەڕوانە. خۆت هەوڵ دە بۆ ناسینی هەرکەسێک، کە بتەوێت. ئەمەش کارێکی گران نییە. لەدوورەوە بڕیار لەسەر کەس مەدە، با بڕیاری کەسیش وات لێ نەکات بڕیار لەسەر کەسێک یاخود شتێک بدەیت. بەر لە ناسینی هەرکەسێکیش، هەوڵی ناسینی خۆت بدە، ئەگەر بەباشی خۆت ناسی، هەڵە ناکەیت لە هەڵبژاردنی بەرامبەرتدا. بۆیە گرنگە لە خۆت بپرسیت، تۆ کێیت؟ هەر بەڕاستی لە خۆتت پرسیوە من کێم؟ بچۆرە بەر ئاوێنەیەک و بە تاسەوە لە مرۆڤی ناو ئاوێنەکە بپرسە:

تۆ کێیت؟

مەپرسە من کێم؟ چونکە کاتێک کە خودێک باس لە خۆی دەکات، هەندێک شت دەپەڕێنێ و هەندێک دێڕیش زیاد دەکات. وا هەست بکە بە تاسەوە دەتەوێ کەسی ناو ئاوێنەکە بناسیت. بەقووڵی لێی بپرسە، تۆ کێیت؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە، کە ڕەنگە وەڵامەکەی دێڕێک بێت، ڕەنگیشە چەندین کتێبی قەبارەگەورە بێت.

تۆ کێیت؟

# ٢

ڕەنگە پرسیارێک لای تۆ ئامادەیی هەبێت. پرسیاری ئەوەی بۆچی ماڵی نەنکتم بۆ خوێندنەوەی ئەم نووسراوە هەڵبژاردووە ؟ بۆچی هیچکام لە خانووەکانی ئەوسای خۆمانم دیاری نەکردووە؟ دوو هۆکاری هەیە:

١-چونکە من ئەو ماڵەم زۆر خۆش دەویست.

٢-چونکە ئەو کاتەی من لە ئێوە دوور کەوتمەوە، ئێوە، تۆ و هانیکۆی خوشکت، لەوێدا دەژیان و هەتا کاتی نووسینی ئەم نامەیەش، ئێوە لەوێدان، ڕەنگە تەواوی منداڵیتان لەوێدا بەسەر بەرن، کێ دەزانێت؟

ئەو سەربانە و ئەو ماڵە بۆ من تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، کە باوەڕم وایە هیچکام لە ئەندامانی ماڵی نەنکت، لە گۆشەنیگای منەوە لەو ماڵەی نەدەڕوانی. نەنکت هەمیشە بۆڵەی دەهات، چونکە باپیرت بەزۆر هێنابوویە ئەو ماڵەوە. پوورەکانیشت پێیان وا بوو لەو ماڵەدا لە دونیا دوور دەکەونەوە.

منیش هەرکات بمویستایە لە دونیا دوور بکەومەوە و لە دونیا هەڵبێم، بۆ خۆدزینەوە لە دونیا، دەهاتم بۆ ئەوێ. هێمنییەکی سەیری هەیە. من زیاتر لەوە خۆشم دەهات، کە سروشت تێیدا دەستێکی باڵای هەبوو.

هەرگیز حەزم لە دیوی ناوەوەی ئەم ماڵە نەبووە، ژوورگەلێکی

ساردوسڕ پێچەوانەی دیوی دەرەوەی، ژیان تێیدا تاقەتپڕووکێنە. دەبێت
هەمیشە دابنیشیت و ڕووت لە تیڤی بێت. هەمیشە پەردەکانی ئەم ماڵە بە
ڕووی دونیادا دادراونەتەوە. دەرگاکانی هەمیشە داخراون. شەوان هەر
لە سەرەتای هەڵهاتنی مانگ و هاتنی ئەو بە میوانی، ئیدی دانیشتووانی
ئەم ماڵە خەو لەلایان ئامادەیی هەیە و ناچارت دەکەن تۆیش بچیتە ناو
جێگەوە، بەڵام من هەرگیز ئەوەم نەکردووە، ئەڵبەت تۆیش.

ئێواران ماڵ پڕ دەبوو لە عەلاگەی ڕەشی پڕ لە تووڕەیی، کە
باپیرت لەگەڵ خۆی دەیهێنانەوە. نەنکت هەر پێی دەکرا بە پوورەکانت
بڵێ، سووراحییەک ئاو بکەنە ناو سەماوەرەکەوە. شەو و ڕۆژ سەماوەر
لە داخاندا هەر دەکوڵێت، پەنجەرەکان و دڵەکان هەڵم دەیانگرێت. ئەوەی
من دڵم پێی خۆش بوو لە دیوی ناوەوەی ئەم ماڵەدا، تەنیا چرایەک
بوو، کە لە ماڵی خۆمان بوونی نەبوو، چونکە دەترسام تۆ و هانیکۆ
هەناسەتان بە بۆنەکەی تەنگ ببێت، بە بینینی ئەو چرایە بە داگیرساوی،
لەوە تێدەگەیت ژیانی سادە چ بەهایەکی هەیە.

دەمەوێت زیاتر باسی دیوی دەرەوەی ئەو ماڵە بکەم، ئەڵبەت تۆیش
هەموو ئەم شتانە دەزانیت، بەڵام دەمەوێت لەوە تێبگەیت، کە ئەو
ماڵە بەلای منەوە گرنگ بووە، بۆیە کردوومە بەو شوێنەی تۆ ئەم
نووسراوەی تێدا بخوێنیتەوە.

هەر کە لە دەرگای دیوی ناوەوەی ئەم ماڵە دەهاتیتە دەرەوە،
شنەبایەکی فێنک بەرەو ڕووت دەهات و بەهێواشی سەروقژی
دەجووڵاندی، لەوێدا ئیدی هەستت بە جیاوازیی گەورەی نێوان دوو
زەمەن دەکرد لە یەک کاتدا، زەمەنی ئەودیو دەرگاکە، لەگەڵ زەمەنی
ئەمدیو دەرگاکە. بۆنوبەرامەی ڕێحانە و گوڵە باخ و تەڕیی گوڵەکان
و خاکی باخچەکە بە ڕووتدا دەهات. چیمەنە سەوزەکە هەمیشە تەڕ
بوو، کاتێک تۆ لەگەڵ باوکتدا یاریی دوگۆڵێت تێدا دەکرد، جەستەت

تەڕ دەبوو، چونکە هەمیشە دەکەوتیت. هەمیشەیش باپیرت لەوە تووڕە دەبوو، کە ئێوە بە تۆپەکە گوڵەکانیتان دەشکاند. تۆ جارجار دەوەستایت و بۆنی گوڵەباخێکت دەکرد و دەستت دەکردەوە بە گەمەکردن. ئێواران لە دوورەوە دووکەڵمان لەسەر گردێک دەبینی، وا هەستمان دەکرد گردەکە خەریکی کێشانی نێرگەلەیە. بە پەنجەرەکانەوە بیبەر و بامیێ و تەماتەکانی نەنکت لەسێدارە دراون. جەستەی لاولاو بە دیوارەکانەوە سەمای دەکرد. هەندێک شەو من و تۆ لە باخچەکەدا لەسەر پشت پاڵ دەکەوتین و ئەستێرەمان دەژمارد. یەکێکت ناو دەنا کۆچەر، یەکێکت ناو دەنا هانیکۆ، یەکێک ڕامین و یەکێکی دی باوکت. سەرنجم دەدا هەمیشە درەوشاوەترین ئەستێرەت ناو دەنا (کۆچەر)، نەمدەویست پرسیارت لێ بکەم، چونکە پێم وا بوو لە قەبارەی ئەو پرسیارە بچووکتریت، دەمویست کەمێک گەورەتر بیت، ئەوکات بتخەمە بەردەم ئەو پرسیارە، بەڵام ئیدی لەو کەمە گەورەبوونەی تۆدا من ئامادەییم نەبوو لەلای تۆ. ئێستا بیر دەکەمەوە، کە ڕەنگە شایستەترین وەڵامت پێ بووبێت. دڵنیا نیم ئێستا لەیادت ماوە یان نا؟ وەڵامت پێیە یان نا؟

بەڕاست، ئەگەر ئێستا ئەو پرسیارەت لێ بکەم، تۆ چ وەڵامێکت دەبێت؟ ئەگەر دەزانیت، ئێستا وەڵامم بدەرەوە:

"بۆچی هەمیشە درەوشاوەترین ئەستێرەت ناو دەنا کۆچەر؟"

ئەگەر وەڵامت لایە، هەر ئێستا پێم بێژە، ئەگەر دەستت بە من نەگەیشت و نەتتوانی پێم بڵێیت، لە پارچەکاغەزێکدا بۆم بنووسە و بیکە بە میزڵدانێکی گازییەوە، دەیگەیەنێت بە من، بە منیش نەگات، بە درەوشاوەترین ئەستێرە دەگات.

ئاخۆ تا ئێستاش هەر من درەوشاوەترین ئەستێرەی ئاسمانەکەی تۆم؟

هەنگی دونیاکەت دۆزیەوە؟ گەورە بووە؟ ئەو هەنگی دونیایە تەنیا ئەو کاتەی من دەمناسی، لە تازەبووکێک دەچوو، هەمیشە قژی تەڕ بوو. ئێستاش چیمەنەکە هەر وا بە تەڕی و جوانی ماوەتەوە؟ پیر نەبووە؟ بکەوە، یان دانیشە بە دڵی خۆت، بەڵام وریا بە تەڕ نەبیت. بەڕاست، لەوێدا ماوە؟ ئەگەر تاقەتت هەیە، بچۆرە خوارەوە بۆ ناو چیمەنەکە پاڵ هەیە، بە یارمەتیت، لە سەربانەکەوە سەیرێکی خوارەوە بکە و بزانە هەر لەلای چەپی جەستەی چیمەنە سەوزەکەوە هەنگێکی دونیا بوونی

شەش مانگ لە تۆ گەورەترە، کاتێک ماڵی باپیرم خانووەکەیان تێکدا، من ئەو هەنگی دونیایەم بینی زۆر چکۆلە بوو، هەڵم کێشا و هێنام لەوێدا چاندم. باپیرت پێی وا بوو ناڕوێت و ناتوانێت جێی خۆی لە ژیاندا بکاتەوە، بەڵام ئەو دژایەتیی مەرگی کرد. لەو کاتەوە هەمیشە ئەندازەی باڵای تۆ و ئەوم بە یەک دەگرت، ئەودەم هەندێک جار بە ئەندازەی یەک بوون، بەڵام لەم دوواییانەدا هەستم کرد تۆ گەورەتر بوویت، دڵم بەمە زۆر خۆش بوو. نازانم ئێستا کامتان گەووورەترن؟ ئەگەر تاقەتت هەیە، باڵات بەباڵای ئەو بگرە...

ئێستا کامتان گەورەترن؟ تۆ یان ئەو؟ هەست دەکەم ئەو گەورەتر بێت... نا؟

ئێستا ڕەنگە هەردووکتان گەورە بووبن هەردووکیشتان عاشق بن، ئەو عاشقی دارهەنجیرەکەی تەنیشتی بووبێ و تۆیش عاشقی گوڵەیاسەمینێک، کێ دەزانێت؟ بەبیرم دێت جارێکیان لەتەنیشتی هەنگی دونیاکەوە وێنەیەکم گرتیت، تۆ لەوێدا گەورەتریت، لە ناخی دڵەوە پێدەکەنیت. ئەرک نەبێت، بە هەمان شێوە وێنەیەکی دی پێکەوە بگرن و بۆ منی بنێرن، تکایە دیسان لە دڵەوە پێبکەنە با وا دەر بکەویت، کە زۆر دڵخۆشیت، دەمەوێت دڵخۆشییەکانت لە چوارچێوە بگرم. هەست دەکەم ڕۆحی تۆ و هەنگی دونیاکە زۆر لە یەکدی نزیکن.

ماوەیەک بەر لە ئێستا کاتێک هاتم بۆ سەردانی تۆ و هانیکۆ، لە بەردەمی چیمەنەکەدا جۆلانەیەکم بینی، ئەمە بێگانە بوو بە باخەکە، تۆ و هانیکۆم هەڵگرت و لەسەر جۆلانەکە دام نان.

لەودیوی چیمەنە سەوزەکەوە باخێکی گەورە بوونی هەیە، پڕە لە داری زەیتوون و هەنجیر و هەنار، کە هەمیشە وەکوو منداڵ ژێریان تەڕە. ئێستایش هەر وان؟

من و تۆ کە دەچووین بۆ ماڵی نەنکت، زۆربەی ئێواران بەناو ئەو باخەدا پیاسەمان دەکرد. هەندێک جار دەستمان دەبرد هەنجیرێک، هەنارێک، دڵێکمان لێدەکردەوە. زۆربەی نیوەڕوانیش لە تۆ تووڕە دەبووم، کە بۆچی لەبەر تیشکی بەتینی هەتاودا لە باخەکەدا یاری دەکەیت؟ نەمدەویست پێستت، کە لە پێستی هەرمێ دەچوو، ڕەنگی تێک بچێت. تۆش هەر کە گوێت لە دەنگی من دەبوو، دەچوویتە ژێر سێبەری دارتووەکە و دەتویست من هەڵبخەڵەتێنیت، دواتر کە من نەدەمام، هەمان شتت دووبارە دەکردەوە. لە پەنجەرەکەوە سەیرم دەکردیت، کە چۆن جوچکەکانی نەنکت ڕاو دەنا و هێلکەی مریشکەکانت دەر دەهێنا و بەردت دەگرتە پەڕەسێلکەکان و هێلکەشەیتانۆکەکانت دەشکاند و لەسەر ئەژنۆ لە چیمەنەکەدا دوای پەپوولە دەکەوتیت. هەمیشە پەڕی پەڕەسێلکەکانت لە گیرفانتدا گل دەدایەوە. دایکان زۆر کات حەز دەکەن بەدزییەوە سەیری منداڵەکانیان بکەن، وەک چۆن من هەمیشە ئەوەم دەکرد، ئەگەر باپیرت گوڵەباخەکانی ببڕیایەتەوە، دەمتوانی باشتر تۆ ببینم. هەندێک کات لە سووچێکی باخەکەدا دادەنیشتم و دەمویست پێستم برۆنزی بکەم.

هەمیشە ژیان لەو باخەدا لە زیندووبوونەوەدا بوو، بەتایبەت بەیانیان زۆر بەڕوونی هەستت بە سادەیی ژیان دەکرد، لە ناوەوەیش هەستت بە کوشتنی خەونی هەندێک لە ئەندامانی خێزانەکە دەکرد.

شەوان مانگ زۆر بەڕوونی دەبینرا، ئەمە هۆکارێکی باش بوو بۆ ئەوەی من ئەو ماڵەم زۆر خۆش بوێت، هەستت دەکرد مانگ زۆر لێتەوە نزیکە، بە جۆرێک، پێت وا بوو ئەگەر بەردێکی تێ بگریت، زۆر بەئاسانی بەری دەکەوێت. یان هەندێک کات کە لەمدیوی تەنافەکەوە پاڵ دەکەوتین، وا دەهاتە بەرچاومان مانگ بە تەنافەکەدا هەڵخراوە و جلگیرەیەکی لێ دراوە.

هەمیشە بە پێپلیکانەکاندا سەر دەکەوتین بۆ لای مانگ، هەمیشە لقە شکاوەکانمان ناو دەنا مردن، گەڵا تازەکانیش ژیان، هەمیشە فوومان لە تۆزی سەر گەڵاهەنجیرەکان دەکرد و هەوامان پیس دەکرد، لەوێڕا بینمان بە ژیانەوە دەنا، لەوێڕا کات زیاتر لە بیستوچواری تۆمار دەکرد.

# ٣

گوێم لە دەنگی منداڵێکە، لە حەوشەی ماڵە دراوسێکەمانەوە دێت، زووزوو بە دەنگە زیقنەکەی دەقیژێنێ:

«دایکە... دایکە...»

دڵم دادەخورپێ. بەپەلە ئەم نووسینە جێ دەهێڵم و لە پەنجەرەکەوە سەیری ماڵە دراوسێکەمان دەکەم. دەبینم منداڵێکی دی دەیەوێت پەشمەکەکەی لێ بستێنێ، ئەمیش هاوار بۆ دایکی دەبات.

بیر دەکەمەوە ئەگەر تۆ و هانیکۆ کەسێک بیەوێت پەشمەکەکەتان لێ بسێنێ، هاوار بۆ کێ دەبەن؟ بانگی کێ دەکەن و کێ دەخەنە شوێنی من؟ تووڕە دەبم و پەردەکە دادەدەمەوە، پێم هەزم ناکرێت بانگی کەس بکەن، ئاسان نییە کەس بخەنە شوێنی من، ئیرەیی بەو کەسە دەبەم، کە هاواری بۆ دەبەن. تا ئێستا بیرم لەمەیان نەکردبووەوە، بەقووڵی بریندار دەبم. وەک خوی هەمیشەییم لێوی خوارەوەم دەمژم و سەیری نینۆکەکانم دەکەم. بۆ خۆدزینەوە لە خەیاڵی ئێوە، بڕبەنەکە هەڵدەگرم و نینۆکەکانم ڕێکتر دەکەم. تکایە ڕامین، جگە لە من، بە کەسی دی مەڵێن (دایکە). ئەوە قورسترین شتە، کە دایک هەستی پێ بکات. هەستێکی وەها، مرۆڤ هەلاهەلا دەکات.

بۆنی گەنمەشامیی برژاو و تەقەتەقی دەگاتە ژوورەکەی من، کە (سلیم) خەریکە دەیبرژێنێت.

تەلەفۆن هەڵدەگرم و تەلەفۆنت بۆ دەکەم

نەنکت وەڵام دەداتەوە، داوای تۆی لێ دەکەم.

دەڵێیت، «ئەلوو!»

دڵم پڕ دەبێت، ددانەکانم لە یەک گیر دەکەم و دان بە خۆمدا دەگرم، تا نەگریم. چەند جارێک بەپەلە چاو دەترووکێنم و دەڵێم:

«ڕامینی دایە.... باشی ئازیزم؟»

«باشم.»

«جەژنی لەدایکبوونت پیرۆز.»

«چی؟»

دەڵێم، «ئەمشەو یادی لەدایکبوونتە، نەتزانیوە؟»

کەمێک بێدەنگ دەبیت و دەڵێیت:

«نا.»

هیچکەس وەکوو دایک یادی لەدایکبوونی منداڵی بۆ گرنگ نییە.

دەڵێم، «ڕامینی دایە، دیارییەکم بۆ پۆست کردوویت، بە دەستت نەگەیشتووە؟»

وەڵام نادەیتەوە. دەزانم ئەوە مانای ئەوە نییە کە هیچ وەڵامێکت پێ نییە، بەڵکوو دڵت پڕە و ناتەوێت هیچ بڵێیت. دەزانم چەندین پرسیار هەن و دەتەوێت بیانکەیت، بەڵام ئەوە ناکەیت، ڕەنگە ترسی گەورەت لە وەڵامەکان هەبێت. بێدەنگییەکەت لە من دەچێت، دڵخۆشم بەمە.

جارێکیان لێت پرسیم، «کەی دەگەڕێیتەوە؟»

وەڵامم پێ نەبوو، بۆ خۆدزینەوە، لێم پرسیت:

«لە وانەکانتدا زیرەکیت؟»

تۆ وەک ئـەوەی گوێبیسـتی پرسـیارەکەی مـن نەبووبیت، دیسـان پرسیتەوە:

«کەی دەگەڕێیتەوە؟»

بمبوورە، من هێشتا ئەو وەڵامەم پێ نییە.

ئێسـتا هیچ باسـێک ناورووژێنیـت، ئێسـتا پرسـیاری گـەورە ناکەیـت، کاتێکیـش مـن پرسـیار دەکـەم، هەمـوو وەڵامـەکان بـە بەڵـێ یـان نەخێـر کۆتایی پـێ دەهێنیـت و کورتیـان دەکەیتـەوە.

گوێـم لـە هانیکۆ دەبێـت، داوای تەلەفۆنەکـە دەکات. دەیدەیتـێ. هانیکۆ دەڵێت:

«کۆچەر!»

ئـەم وشـەیە ڕام دەچڵەکێنێـت. یەکەمیـن جـارە وام پـێ بڵێـت. دڵـم پڕ دەبێت، دەگریـم، هیچـم بۆ ناوترێت، دڵنیا دەبـم لـەوەی هانیکۆ وشـەی (دایە)ی لەبیر کردووە. ئـەو پێچەوانـەی تـۆ قسـە زۆر دەکات، باسـی چوون-بۆ-قوتابخانـەی تۆ دەکات. بۆم بـاس دەکات چۆن دەفتەرەکانـی تۆ دەنووسێت و کتێبەکانـت دەدڕێنێت. چۆن لەسـەر جۆلانـە تازەکە جۆلانـە دەکات و تـۆ پاڵی دەنێیت. چۆن پوورت پەنجـەی هەڕەشـەی لـێ بـەرز دەکاتـەوە، کاتێک ماکیاژەکانـی بـەکار دەهێنێت. نەنکت چۆن لـە کاتـی جلگۆڕینـدا چڕنـووک لـە قوڵـە ناسـکەکانی دەگرێـت. بـەو زمانـەی تـازە وشـەکان جیـا دەکاتـەوە، هەمـوو شـتێکم پـێ دەڵێت. ئـەو زۆر مـن ناناسـێت، تەنیا دەزانێـت مـن دایکـی ئـەوم، چونکـە مـن و ئـەو تەنیـا دوو سـاڵ پێکـەوە بوویـن، ئـەو زیاتـر بـە هـۆی تـۆوە مـن دەناسـێت.

تەلەفۆنەکـەی لـێ وەردەگریت و پێی دەڵێیت قسـە نەگێڕێتـەوە. باسـەکە دەگۆڕیت، دەڵێیت:

نالێت.»
«دایکە، ئێستا مامۆستا (ژوان) وانەمان پێ
دیسان وشەی دایکە ڕام دەچڵەکێنێت. هانیکۆ دەگری، دەنگی گریی
باپیرت دەبیستم لەپشتی تەلەفۆنەوە، گیزەی سەماوەرەکەش.

لێت دەپرسم:

«هیچت ناوێ بۆت بنێرم؟»

دەڵێیت، «با.»

«چی، ئازیزم؟»

وەک ئەوەی بتەوێت بڵێیت تۆم دەوێت، بێدەنگ دەبیت، دڵت پڕ دەبێت، چاوم پڕ دەبێت. هەناسەکانت دەخوێنمەوە لەودیو تەلەفۆنەکەوە. بە دەنگێکی نزم دەڵێیت:

«هین.»

«بڵێ کوڕم، چی؟»

«هیچ، هیچم ناوێت.»

ماڵئاوایی دەکەیت، من هیچ ناتوانم بڵێم.

هانیکۆ تەلەفۆنەکەت لێ وەردەگرێت، بەدەم هەنیسکەوە پێی دەڵێم:

«دایە گیان، هیچت ناوێت؟»

دەڵێت، «با... گەنمەشامی، چپسی تو تو، پسکیتی ئۆکەی، پەشمەک...»

دڵم خورپە دەکات، نامەوێت پەشمەک بخوات، تا کەس لێی نەستێنێ و ناچار نەبێت بانگی کەس بکات.

«چی تر؟»

«چەترێک بۆ کاکە.»

دڵم وەکوو گەنمەشامییەکان خەریکە دەتەقێت، تێدەگەم خەمی تۆیەتی

هەر گوێی بۆ دەگرم، ناتوانم هیچ بڵێم، زۆر شکور خەمی یەک دەخۆن. لە بێدەنگیی مندا تەلەفۆنەکە دادەخاتەوە.

لەتاودا لەسەر دەم خۆم دەدەم بەسەر چەرپاکەمدا، توند چەرچەفەکە ڕادەکێشم و دەگریم. دڵم لەم شەوە ڕەشتر دەبێت. زەنگی دەرگاکە ڕام دەچڵەکێنێت. لە پەنجەرەکەوە سەیری خوارەوە دەکەم، دیسان میوان.

بە قۆڵی بلوزەکەم چاوم دەسڕم، دەرگای ژوورەکە بە کلیل دادەخەم، تا کەس تەنیاییم نەشێوێنێ. هەموو کانتۆرەکە تێک دەدەم، بەدوای CD یادی لەدایکبونی یەکەمساڵتدا دەگەڕێم، دەیدۆزمەوە و دەیخەمە سەر کەمپیوتەرەکە.

(لەدیمەنێکدا بەدوای مندا دەگریت، دەستت بە پێیەکانی منەوە گرتووە، دەتەوێت لە باوەشت بگرم، لە جەنجاڵی و کۆبونەوەی میوانەکان دەترسیت. دەتگرمە باوەش، دواتر دات دەنێمەوە، خۆم کەمێک دوور دەکەومەوە و بە ئاماژەی دەستەکانم، بانگت دەکەم. تۆیش لە هەنگاوەکانت دەترسیت، لێیان دڵنیا نیت، یەکەمین هەنگاو دەنێیت، دەکەویت، پاشان هەڵدەستیتەوە، دیسان دەکەویت، هەتا لێم نزیکتر بیتەوە، من زیاتر دوور دەکەومەوە و بانگت دەکەم. تۆ هەنگاوەکانت ڕۆژ دوای ڕۆژ گەورەتر بوون، ئێستا ئیدی بەبێ بانگکردنی من و ئاماژەی دەستەکانم، تۆ دەتوانیت بڕۆیت و پێ بەسەر دڵی ژیاندا بنێیت.

لە دیمەنێکی تردا، لە باوەشمدا ڕاکشاویت، مەمکەمژە سەوزەکەت لە دەمدایە. ڕومەتە گۆشتنەکانت سوور هەڵگەڕاون، دەستێکت لە قژمدایە و چاوەکانت کز بوون، دەتەوێت بنویت، منیش بە هەردوو دەستم باوەشم پێدا کردوویت و ڕات دەوەشێنم، ئەوەندە دڵخۆشم، دەڵێیت باوەشم بە گەردووندا کردووە.)

دەنگی میوانەکانی بەشی خوارەوەیماڵەکە، بێزارم دەکەن.

کەمپیوتەرەکە وزەی تێدا نەما، تاقەتم نییە بچم شاحینەکەی بهێنم. لەسەر پشت پاڵ دەکەوم، دەمەوێت بنوم، ناتوانم ئەوە بکەم. تەلەفۆن بۆ هاوڕێ شاعیرەکەم دەکەم، داهاتووی تۆ وەکوو ئەو دەبینم، هەر وەک چۆن منداڵیتان لە یەک نزیکە، تەنانەت شێوەی ڕووخساری منداڵیشتا زۆر لە یەک دەچێت. ئەویش وەک ئێوە بە دڵەوە نووساوە، لێی دەپرسم:

«ئەگەر دایکت بوونی هەبێت، چی دەکەیت؟»

دەزانم پرسیارێکی قوڕ و بێمانایە، دەشزانم ئەو بریندار دەکەم، بەڵام خۆپەرستانە ئەو پرسیارە دەکەم:

«ئەوە خەونێکی خۆشە، ئەگەر ئەو بوونی هەبێت، لە هەرکوێ بێت، دەچم بۆ لای و بۆ هەمیشە دەیپەرستم.»

لە هەر حاڵێکدا کە بیر لەم دێڕانە دەکەمەوە، دەگریم، لە هەمان کاتدا دڵخۆشم، لە هەمان کاتیشدا دەیان پرسیارم لەلا گەڵاڵە دەبێت:

-ئایا تۆش هەمان بیرکردنەوەت دەبێت؟

-تۆیش ڕۆژێک بیر لەوە دەکەیتەوە، هەنگاوەکانت ڕووەو دایکت بە تاسەوە بنێیت؟ ئایا ڕۆژگار ئەم عەشقەت بەرامبەر بە من کاڵ ناکاتەوە؟

ئەم پرسیارانە وەکوو ژەنگ من دەخۆن، تا کاتێک گەورە دەبیت و ڕووو لە من دەکەیت. تکایە زوو ئەوە بکە و لەم دڵەڕاوکێیە ڕزگارم بکە، یاخود ڕەنگە من نەتوانم گەورەبوونی ئێوە ببینم. ڕاستت بوێ، تا ئێستا بیرم لەوە نەکردۆتەوە، بەڵام نامەوێت بمرم، تا گەورەبوون و شکۆمەندی تۆ و خوشکەکەت دەبینم.

# ٤

ئەم بەیانییە بە دەنگی گسکی کارەباییەکەی سێلیم بەئاگا هاتم، سەرم خستە ژێر پشتییەکە و توند گوشیم، هەر گوێم لە دەنگیەتی، ناچارم هەستم. سەیرێکی ئاوێنەکە دەکەم، چاوم ئاوساوە، دوێنێ شەو زۆر گریاوم. لە پەنجەرەکەوە سەیری کۆلان دەکەم، ڕقم لەو مندالانەیە، کە یاری دەکەن. ئیرەیی بەو دایکانە دەبەم، کە چاودێرییان دەکەن. دیسان دلم پڕ دەبێت. دەچمە گەرماوەکە و بە جلەوە خۆم دەخەمە بەر دووشەکە، ئاوە ساردەکە دەکەمەوە، سەرم سڕ دەبێت، هەست بە ساردیی ئاوەکە ناکەم، پێم وایە فرمێسکەکانم لە ئاوی دوشەکە زۆرترن:

«دۆعا دەکەم تایەی هەرچی پایسکیلی مندالان هەیە، بتەقێت. تۆپەکان سەیارە لێیان بدات. پەتی کۆلارەکان بپچڕێن. بوکەشووشەکان وردوخاش بن...»

کاتێک دێمە دەرەوە سێلیم گوێ لە گۆرانی مەکسیکی دەگرێت، بەدەم بریقەهێنانی کاشییەکانەوە، خۆی بادەدات، لەگەڵ ماسیحەکەدا، سەما دەکات. دەچمە خوارەوە، سلاو لە نەنە دەکەم. دەنگی تیڤییەکە دێت، بۆ تاوێک تەماشای دەکەم: «لە کەمبۆدیا ئاگر کەوتۆتەوە، لە یانەیەکی شەوانەدا، لە ئەمەریکا شەپۆلێکی بەفربارین، لە چین ڕووداوی هاتووچۆ،» تیڤییەکە جێ دەهێڵم، بەفرگرەکە دەکەمەوە، هیچم بۆ ناخورێت، لیمۆیەک

کۆچەر ئەبوبەکر

دەر دەهێنم و دای دەخەمەوە. تەماشایەکی نەنکم دەکەم، وەک پیشەی، هەمیشەیی گوڵەکان دەسڕێتەوە، پێوەندییەکی پتەو لەنێوان نەنکم و گوڵەکاندا هەیە. پەرداخێک ئاو هەڵدەگرم و دێمەوە سەرەوە، دەست بە نووسین دەکەمەوە.

# ٥

ڕامینی من...

ئێستا حەوت ساڵ و چەند کاتژمێرێک تەمەنتە، ئایا لە کاتی خوێندنەوەی ئەم نامەیەدا، دەزانیت لە حەوت ساڵیدا چۆن بیرت لە من کردۆتەوە؟ چەند بیری دایکت کردووە؟ منیش هەندێک جار پرسیاری گەوجانە دەکەم، ها...

دایکان بەو جۆرەن. هەمیشە پرسیاری چاوەڕواننەکراو لە منداڵەکانیان دەکەن، هەمیشەیش وەڵامی چاوەڕواننەکراو وەردەگرن. هەمیشە نەک دوودڵ، بەڵکوو هەزاراندڵن بەرامبەر منداڵەکانیان.

حەوت ساڵ و نۆ مانگ و چەند کاتژمێرێک بەر لە ئێستا، تۆ بوونی خۆت لە مندا سەلماند.

بیر لەو کاتە دەکەمەوە. خۆم دەبینم ژنێکی منداڵکاری بێئەزموون، ژنێک، کە هێشتا جانتاکەی شانی نوقڵ و مەساسەی تێدایە. لەسەر کارەکەم دانیشتووم، سەرقاڵی کارم. هەست بە بۆنی ناخۆشی ماوسی کەمپیوتەرەکە دەکەم. سەیرێکی هاوکارە کوڕەکەم دەکەم، خەریکی پێڵاوەکانیەتی، لەپڕ دڵم تێکەڵ دێت. ڕادەکەم بۆ توالێتەکە و بەسەر دونیادا دەڕشێمەوە. بە هاوکارە ژنەکانم دەڵێم، هیچ نییە، سەرمام بووە.

وردەوردە هەست بە بۆنی ناخۆشی پیاوەکان دەکەم، هەرکات بەجۆرێک دەیانبینم، دەست بە دەممەوە دەگرم و ڕادەکەم. ڕقم لە بۆنی شێلمی کوڵاوە. قێز لە پەڕی مریشک و کۆترەکان دەکەمەوە. هاوکارە ژنەکان دەڵێن:

خانمی چکۆلە، ڕەنگە تۆ دووگیان بیت.

چییی؟ ئەم وشانە دەموەستێنن، ئەم ڕستەیە تازەیە. چۆن دەکرێت من دووگیان بم؟

ئەم بیرکردنەوەیە مێشکم دەخوات. چۆن دەکرێت لەناو مندا بوونەوەرێک دەست بە ژیان بکات؟ لە کاتێکدا من ئامادەی ئەم پرۆسەیە نیم؟ لە کاتێکدا من هێشتا وەڵامی کۆمەڵێک پرسیارم وەرنەگرتووە، لە ناویاندا پرسیاری ئەوەی، بۆچی لێرەم، لەم هەسارەیە؟ خودی ژیان چییە؟ ئێستا ژیانێکی دی دروست بکەم؟ دەستم هەبێت لە گەشەسەندنی مرۆڤایەتیدا؟ من هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان نەمویستووە هۆکارێک بم بۆ درێژەپێدان و بەردەوامیدان بەمرۆڤایەتی. هەمیشە پێم وا بووە ئەم دونیایە نابێت ئیدی مرۆڤی تێ بخرێت. ئەم پێشبینییەی ئەوان بەتوندی ڕام دەگرێت. بەتوندی بەر خۆم دەکەوم. ئەوەندەش بوێر نیم، بۆ پشکنین سەردانی پزیشک بکەم. چەند ڕۆژێک بە نینۆک-ڕێککردن و دوودڵی بەسەر دەبەم. بۆ ڕزگاربوون لەو خۆخواردنەوەیە، چەند کاتژمێرێک مۆڵەت وەردەگرم و بۆ پشکنین دەچم. چەند جارێک دەچمە بەردەمی دەرگای پزیشکەکە و دەگەڕێمە دواوە، نەفەری دوای خۆم دەنێرمە ژوورەوە، ترسم هەیە بەرگەی وەها وەڵامێک نەگرم. سەرئەنجام، پاڵ بە خۆمەوە دەنێم، دەچمە ژوورەوە. دوودڵییەکەم بە خانمی پزیشک دەڵێم. ئەویش سەری نزیکی، پێنج سانتیم دەهێنێتە خوارەوە، برۆ باریکەکانی لە یەک نزیک دەکاتەوە، لە سەروو چاویلکەکەیەوە، سەیرم دەکات، سەرێکی پڕ لە گومان بۆ منداڵیی من و ئەگەری شەرعی نەبوونی دروستبوونی

تۆ دەلەقێنێت. چەند دێڕێک لەسەر پارچەکاغەزێکی سپی دەنووسێت و بۆ پشکنینم دەنێرێت.

پاش پشکنینی خوێن، پارچەیەک کاغەزی سپی، کە چەند دێڕێکی لەسەرە و بوونی تۆ دەسەلمێنێت، بۆ خانمی پزیشک دەهێنمەوە.

دکتۆرە بەردەوامە لە تەماشاکردنم بە گومانەوە، منیش خوێنم وشک بووە، چاوەڕوانی وەلامم:

«شوت کردووە؟»

«بەڵێ.»

کچم، هیچ شتێک نابێت لە دکتۆر نهێنی بێت، تۆ زۆر منداڵیت تۆ... تۆ...

«تکایە پێم بڵێ، دووگیانم یان نا؟»

«بەڵێ.»

بەسەرسامی سەیری خانمی پزیشک دەکەم، دڵم هێند خێرا لێدەدات، هەست دەکەم دەیەوێت لە سینەم بێتە دەرەوە. هیچ ناڵێم، بەشڵەژاوی دێمە دەرەوە. ڕەنگە بە پێ گەڕانەوەم بۆ سەر کار بیانوویەکی باش بێت بۆ قسەکردن لەگەڵ خۆمدا. شەقامەکان دەبڕم، دەست دەخەمە سەر سکم، هەست دەکەم بارێکی قورسم بەسەر زەوییەوە.

«بەڕاست، من دایکم؟ ژیانێک لەناو مندایە؟»

تۆ لەکوێوە هاتی و هەموو بەرنامەکانی منت شێواند؟

دەگەڕێمەوە سەر کارەکەم، لە ڕاڕەوەکەدا باوکت دەبینم، ئەوەندەی خەمی ئەوەیەتی کە لەکوێ بووم، خەمی شڵەژاوییەکەمی نییە، دەپرسێت:

«لەکوێ بوویت؟»

حەپەساو و گێژ پێی دەڵێم:

«دووگیانم.»

ئەویش وەک من ڕادەمێنێت. سەیری یەکتر دەکەین، بێدەنگ دەبین، بە دوو پەنجەی دەستە ڕاستی، ڕوومەتی چەپم دەگرێ و ڕای دەکێشێت، پاشان دەڕوات.

لە ژوورەکەمدا هاوکارە ژنەکانم پێیان وایە من منداڵم، پێویست نییە تۆم هەبێت. ڕێوشوێنم بۆ دادەنێن، کە خۆم لە دەستی تۆ قوتار بکەم. ئەوان لەبارەی مردنی تۆوە گفتوگۆم لەگەڵدا دەکەن، تۆیەک، کە نووساویت بە ڕۆحمەوە، تۆیەک، کە خەریکبووی جێی خۆت لەناو مندا دەکردەوە. نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بکەم، کە دەبم بە دووان. نەمدەتوانی باوەڕ بەم دابەشبوونە بکەم. بە بڕوای من، هێنانەدونیای کەسێک، کارێکی نامرۆڤانەیە و تاوانەکەی هیچی کەمتر نییە لە کردنەدەرەوەی کەسێک لە ژیان و لە کوشتنی کەسێک. دڵنیا بووم ڕۆژێک بێیتە ژیانەوە، تاوانبارم دەکەیت بەوەی بۆچی هێشتوومە تۆ پێ بخەیتە سەر زەوی، بەڵام من نەمدەتوانی تۆ لە خۆم جودا بکەمەوە، پێم وا نییە هیچ دایکێک وەها کارێک بەپێی ویست و حەزی خۆی ئەنجام بدات. بۆیە بڕیارم دا، تۆ بهێنمە ژیانەوە. ئایا لەمە تووڕەیت؟ هەرگیز ڕۆژێک هەبووە لۆمەم بکەیت، کە بۆچی وەها کارێکم کردووە؟ وەک چۆن من لۆمەی دایکم و باوکم دەکەم؟ ئەوان منیان بوو، نەک لەبەر من، بەڵکوو لەبەر پێویستییان بە من، منیان بوو، چونکە لە وڵاتی غەریبی بوون، دەیانویست من بۆشاییەکیان بۆ پڕ بکەمەوە. یان ڕەنگە لەپێناوی چێژێکی تایبەت و چەند خولەکیدا منیان ڕشتبێتە ژیانەوە. لێم مەگرە، تاوانبارم مەکە، چونکە ئەوە ویستی منیش نەبوو، من هێشتا شەوان وەکوو منداڵێکی بچووک لەژێر جێگەکەمەوە بۆ باوکم دەگریام. هێشتا ئامادە نەبووم منداڵیی خۆم جێ بهێڵم، هێشتا ئەو کاتانەی باوکم دەبینم، وەکوو منداڵ خۆم دەخزێنمە باوەشییەوە، هەمیشە گیرفانەکانی بۆ چوکلێت و بنێشت

دەپشکنم، بەڵام ئیدی دەبوو منداڵێک بە هەموو ئازارەکانییەوە، بە هەموو قورساییەکانییەوە، لە ئامێز بگرم. دەبێت دڵنیا ببمەوە، تۆ بووکەڵەیەک نابیت لە باوەشمدا. تۆ لەناو مندا چەکەرەت کرد، منیش بە ڕەگ و قەد و گەڵاوە هەڵم گرتیت.

لە من تووڕەیت، کە تۆم دروست کرد و پاشان جێم هێشتوویت؟ بۆچی هێشتوومە کاتێک کەسێک پەشمەکەت لێ دەسێنێت، کەس نەبێت ناوی بهێنێ؟

# ٦

بـەردەوام ئاوێنـەکان ڕووبـەڕووی خـۆم دادەنێـم، ناتوانـم خـۆم ڕابهێنم لەگـەڵ گەورەبـوون و کشـانی پێسـتی سـکمدا. ناتوانـم مۆدێلـی جلەکانم بگـۆڕم.

بـۆ شـاردنەوەی سـکم، ورگـم دەکـەم بـە نـاودا. قایـش لەسـەر سکم دەبەسـتم، بەڵام ئیدی ئەمانـەش هیـچ سـوودێکیان نییـە. ڕانایـەم لەگەڵ ئەو دەموچاوانـەی بـە گومانـەوە سـەیرم دەکـەن.

دەچـم بـۆ پشـکنین. ڕیزێـک ژنـی دووگیـان دەبینـم، ڕقـم لـە سکە گەورەکانیانـە، ڕقـم لـە خۆمـە، کـە جەسـتە ڕێکەکـەی جارانـم شێواوە. تەماشـای خـۆم دەکـەم، لـە وان باشـترم، ڕیزەکـە بەجێ دەهێڵـم. کۆمەڵێک ژن دەورەم دەدەن و هەریـەک بـە جۆرێـک ڕێنماییـم دەکـەن، کـە پێویستە جلی گـەورە و گونجـاو بپۆشـم، تـا تـۆ ئـازارت پـێ نـەگات و بەباشـی گەشە بکەیـت.

وا دەکـەم، دەچمـە بـازاڕ و لـە هەمـان جلەکانـی ئـەوان دەکـڕم. کاتێک بە ڕێگـەدا دەڕۆم، لـە شووشـەی هەمـوو دوکانەکانـەوە سـەیری خـۆم دەکەم. پێـم سـەیرە کـە لـە هەمـوو جامەکانـدا تۆپێـک بـە مەعیدەمـەوە نووساوە. وا دێتـە بەرچـاوم، کـە شـووتیەکم بـە سـاغی قـووت داوە. لـە جامخانەی

دوکانەکانـەوە تەماشـای ئـەو جـل و پێڵاوە بچکۆلانانـە دەکـەم، کـە بـۆ منداڵی بچووک دروسـت کراون. پەتوویەکت بۆ دەکڕم، کە هەتا تەمەنی چوار سـاڵیش بەبـێ ئـەو پەتـووە نەتدەتوانـی بنوویـت. کچـە شـاعیرێکی هاوڕێـم دەبینـم، ئەویـش بـە هەمـان شـێوەی مـن دووگیانـە. ڕوو لـە یـەک دەکەیـن، یەکتـر مـاچ دەکەیـن، تـۆ و منداڵەکـەی ئەویـش ناچـارن بنووسـێن بـە یەکتـرەوە.

پێکـەوە پانتاییـی شـەقامەکە داگیـر دەکەیـن. ئێمـە چوارقۆڵـی وەکـوو مـراوی بـە شـەقامەکاندا دەڕۆیـن. ئێمـە چوارقۆڵـی ژیـان داگیـر دەکەیـن. ئێمـە چوارقۆڵـی مرۆڤایەتـی زیـاد دەکەیـن. پیاوێـک دەبینیـن عەمبـەرووەری دەفرۆشـێت، دەممـان پـڕ دەبێـت لـە ئـاو. نۆرەبـڕی لـە منداڵـەکان دەکەیـن. هاوڕێکـەم دەڵێـت:

«تۆ جوانترین دووگیانی، کە تا ئێستا بینیبێتم.»

ئەوەنـدە پێدەکەنـم، بـە پشـتدا دەکـەوم، عەمبـەرووەری لـە قوڕگـم دەگیرێـت. لـە پێکەنینـدا سـکم وەکـوو میزەڵانێـک، کـە ئـاوی تێـدا بێـت، دەجووڵێتـەوە، دڵنیـام تۆیـش پێکەنینـت بـەو قسـە گەوجانەیـە دێـت.

# ٧

ڕامینی دایە، بێزار نەبوویت لە خوێندنەوە؟ ئەگەر بێزار بوویت یان خەوت دێت، واز لە خوێندنەوە بهێنە و بنوو.

دەزانیت کاتێک لەلای من بوویت، هەمیشە دەبوو بەر لە نووستن چیرۆکت بۆ بگێڕمەوە؟

شەو دوای شەویش داوای چیرۆکی نوێت لێ دەکردم. چیرۆکی بەرماڵەکەی عەلادینت لەیادە؟ دەتەوێت بیرت بخەمەوە؟ حەز دەکەیت؟ کەواتە بڕۆ لەسەر جێگەکەت پاڵ بکەوە و هەست بەدەنگی من بکە، وێنای جەستەی من بکە، کە لەسەر قۆڵم ڕاکشاویت. منیش دەستێکم دەخەمە ناو قژە کورتەکەت و بەهێمنی بۆت دەگێڕمەوە. وا بکە، هەست بە بوونی دایە بکە لە تەنیشتتەوە، سەر بنێ بە دڵمەوە، گوێ لە شتێک بگرە، کە لای چەپمەوە بۆ ئێوە لێدەدات. دەی، ئێستا بۆت دەگێڕمەوە:

«کچێکی چکۆلە هەبوو، هەموو خەونی ئەوە بوو بەرماڵە ئەفسووناوییەکەی عەلادینی هەبێت، تاکوو بتوانێت پێی بچێت بۆ سەر مانگ.

هەمیشە دەچووە سەر بەرماڵەکەی نەنکی، چاوی دادەخست، چاوەڕوان بوو بەرماڵەکە بفڕێت. ئەم کردارە هەموو ڕۆژێک دووبارە

دەکاتەوە و بەرماڵ هەر نافڕێت. ڕۆژێک تووڕە دەبێ، بەرماڵەکە فڕێ دەداتە کۆڵان، نەنکیشی بەم کارە زۆر تووڕە دەبێ و داوای لێ دەکات بەرماڵەکە بهێنێتەوە. کچەکە دەیهێنێتەوە، پاشان نەنکی ناچاری دەکات بەرماڵەکە ماچ بکات و بینێ بە نێوچاوانییەوە، بەڵام کچەکە کەللەڕەق دەبێت و ئەو کارە ناکات، نەنکیشی پێداگری دەکات و زللەیەک لە کچە چکۆلە دەدات. ئیدی لەو ڕۆژەوە ڕقی لە بەرماڵەکەی نەنکی و تەواوی بەرماڵەکان دەبێتەوە، تەنانەت بەرماڵەکەی عەلادینیش.

ڕامین... خەوت لێ نەکەوتووە؟ دەزانیت ئەو کچە چکۆلەیە کێ بوو؟ خۆت بیڵێ...

ئێستا بنو، منیش یەکێک لە ئینجانەکانم شکاوە، دەبێت بچم ئینجانە بکڕم.

ئێستایەکی باش بۆتۆ.

# ٨

بـە مەبەسـتی کڕینـی ئینجانـە، لـە مـاڵ دەچمـە دەرەوە. هـەوای داخراوی ئـەم ماڵـە، خەریکـە دەمخنکێنێت. ڕێگـە نامباتـەوە سـەر ڕێگەکـەی تۆ، پیاسـەکردنیش چێـژی جارانـی نەمـاوە. کاتێـک بـە ڕێگـەدا دەڕۆم، دەستە بچکۆلەکانـی تـۆ و خوشـکەکەت لەنێـو دەسـتمدا نیـن. کەسـێک نییـە ببێت بـە هاوسـەفەری ڕێگـەکان. هەمیشـە دیمەنـی منداڵێـک لەگـەڵ دایکیدا ڕام دەچڵەکێنێت. ئیرەیـی بـە هەمـوو دایکەکانـی دونیـا دەبـەم. ڕقـم لـە هەموو منداڵەکانـی گەردوونـە. توانـای بینینـی دیمەنـی دایکێکـم نییـە، کـە کەرەستەی یاریکـردن بـۆ منداڵەکـەی دەکڕێـت. دەمەوێـت دوکانـدارەکان بێڕەحمانـە بکـوژم، تەنانـەت نەفـرەت لـە چۆلەکەکانیـش دەکـەم، کـە دەبینـم ماچی دەنووکـی کـراوەی بێچووەکانیـان دەکـەن. سـواری تاکسـیەک دەبـم، وێنـەی منداڵەکـەی هەڵواسـیوە.

«کاکە بێزەحمەت، ڕای بگرە، دادەبەزم.»

ڕێگـەکان بەتەنیـا و پیـادە ببـڕم باشـترە لـەوەی وێنـەی منداڵێـک ببینم، کـە بـەدەم ژیانـەوە پێدەکەنێت. ئەمـە ئـەو دۆخەیـە، کـە مـن تێیـدا هەسـت بە شـێتبوون دەکـەم. ئەمـە سـەرەتای دەرکەوتنـی شـێتییە لـە دایکتـدا، ئەڵبەت هـەر ئـەو کاتـە سـەرەتای شـێتیم بـوو، کـە یەکـەم دێـڕم نووسـی. پێدەچێت

کاتێک تۆ ئەم دێڕانە دەخوێنیتەوە، من شێتێکی تەواو بم.

ڕامین، زۆر حەز دەکەم کەسێک بم تەواو گەمژە، تا هیچ شتێکم نەبێت بۆ خواستن، ئەگەر نەتوانم بەشێک لە گەمژەیی کەم بکەمەوە، باشترە خۆیشم ببم بە گەمژە.

نامەوێت شتێکت لێ بشارمەوە، وەک چۆن دایکم و باوکم لە خەڵکیان شاردەوە.

من دوای دوورکەوتنەوەم لە ئێوە، بۆ ماوەی مانگێک لەژێر چاودێریی پزیشکی دەروونیدا بووم. بە بڕوای پزیشک، ئێستا باشتر دەر دەکەوم، بەڵام نەخۆشییەکی کوشندە لەنێو مندا بوونی هەیە، کە هەرگیز چارەسەر نابێت، ئەویش مەراقی گەڕانەوەی ئێوەیە بۆ لام، بە هەمان ئەو تەمەنەوە، کە جێم هێشتوون تا چێژ لە منداڵیتان وەربگرم، دەزانم ئەمە تەنیا خەونێکە و هیچی دی. زەمەن لەبەر حەزی من ناگەڕێتەوە یان ناوەستێت. ژیان دڵڕەقانە وەکوو تۆپێک شەقم تێ هەڵدەدا و ڕۆژگارەکانم پێ دەبڕێت.

ڕێگەکە وەک هەمیشە بەتەنیا دەبڕم. تۆ دەزانیت من هەموو ژیانم هەر تەنیا بووم و هەستم بە تەنیاییەکی قووڵ کردووە؟ تەنیا ئەو کاتانە نەبێت، کە تۆ لەناو مندا بوویت. تەنیا ئەوکاتانەی تۆ و هانیکۆ لەژێر پێستمدا بوون، یاخود لەتەنیشتی من ئامادەییتان هەبوو، تەنیا ئەو کاتانەم هەیە، کە ناوی بنێم ئاوەدانی. تەنیایی هەر ئەوە نییە کەست لەدەور نەبێت، بەڵکوو هەرکات هەستت کرد کەس نییە ڕۆح بنێ بە ڕۆحتەوە، ئیدی تۆ لە تەنیاییەکی کوشندەدایت.

# ٩

ئینجانەکە دەکرم و دەیهێنمەوە. لە دەرگای حەوشەوە پشیلەکە بە میاومیاو دوام دەکەوێت. قاپێک ماست لە بەفرگرەکە دەر دەهێنم، لە پشتمەوە دەیگرم و بەدزی نەنەوە دەیهێنمە دەرەوە، ترسم هەیە نەنکم بیبینێ. نەنکم ڕقی لە پشیلەکانە. ماستەکە دەدەم بە پشیلەکە، بەدوامدا دەمیاوێنێت، هانیکۆم بیر دەکەوێتەوە، کە هەمیشە بەدوامدا دەگریا.

پشیلە خۆی لە پێیەکانم دەسوێت، دڵم پڕ دەبێت، کێ دەڵێت هانیکۆ نییە لە پێستی پشیلەکەدا؟ تۆ بڕوات بەوە هەیە کەسێک بمرێت پاشان لە بەرگی بوونەوەرێکی دیدا بێتەوە سەر زەوی؟ بۆ نموونە لە بەرگی پشیلەیەک یان تووتەڵەیەک؟ بەڵام خۆ هانیکۆ نەمردبوو، (خودا نەکات بڵێ، خودا نەکات) ئیدی بۆچی وەها هەستێکم هەبوو؟ پێوەندییەکی قووڵ و پتەو لەنێوان من و پشیلە و کەروێشکەکاندا هەیە، تۆ یان کەسێکی دی، ناتوانن درکی پێ بکەن. پشیلە و کەروێشکەکان لە ڕۆحی مرۆڤەوە نزیکن. هاوڕێیەتیکردنی پشیلە و کەروێشکەکان زۆر لە هاوڕێیەتی و دۆستایەتیکردنی مرۆڤەکان خۆشتر و پاکترە.

دەرگا بە ڕووی پشیلەکەدا دادەخەم، دێمە ژوورەوە. هەمیشە لە تەنیایدا پەنا بۆ پشیلەکە دەبەم، دڵمان بە یەکتر خۆشە. من و پشیلەکە

فریای تەنیاییی یەکتر دەکەوین. تەماشایەکی ئینجانەکان دەکەم، چەند گەلایەکی بچووک دەبینم، خەریکن جێی خۆیان لە ژیاندا دەکەنەوە، بەدزی نەنکمەوە دەیانقرتێنم.

نەنکم دەڵێت «گوڵەکانی حەوشە دەشکێن.»

ناوێرم بڵێم پشیلەکەیە.

دەڵێم، «ڕەنگە ڕەشەبا بێت.»

دەڵێت، «ڕووی ڕەشەباکان ڕەش بێت.»

# ١٠

ڕۆژێک چووم بۆ پشکنین، تا بزانم کوڕیت یان کچ.

ئەڵبەت زۆر حەزم دەکرد کچ بیت. دایکان حەز دەکەن یەکەم منداڵیان کچ بێت، منیش وا بووم. بیرم دەکردەوە قژت بە دووپەلکی دەبەستم و کراسی جوانت لەبەر دەکەم، تۆیش بێزار دەبیت، تەوقەکانی قژت لێدەکەیتەوە، من هەمان شت دووبارە دەکەمەوە. دەمویست وەکوو بوکەشووشەکانی منداڵیم لەژێر کۆنترۆڵی خۆمدا بیت، بەڵام کچبوون ئاسان نییە، هاااا!

ئەگەر کچ بوویتایە، دەبوو بکەوتیتایەتە جەنگەوە، جەنگ هەر لە خێزانەکەی خۆتەوە هەتا کۆمەڵگە و دەوڵەت و یاساکان و... هتد.

لەگەڵ ئەوەشدا، کچبوون زۆر چێژبەخشە، ڕامین، ئەگەر کچ بیت، دەتوانیت بە برژانگەکانت دونیا هەڵگێڕیتەوە. دەتوانیت وا بکەیت، پیاوان ڕیشیان بتاشن، یان ڕیش بهێڵنەوە. دەتوانی وا بکەیت، پیاوان لەپێناوتدا مەچەکی خۆیان ببڕن، سەر بەدیواردا بکێشن. دەتوانی بە یەک غەمزە دونیا و دینی پیاوان بگۆڕیت، شەڕەکان بگۆڕیت بۆ ئاشتی، مێژووی شارستانییەتەکان بە ئاڕاستەیەکی تردا ببەیت. دەتوانیت وا بکەیت مرۆڤایەتی بەردەوامی هەبێت، یان بەپێچەوانەوە، بەڵام ئەگەر کچ

بیت، هەرگیز کل و کلدان و مێخەکبەنت نابێت. چێژ لە تەماشاکردنی جەستەت نابینی، ئەو کاتەی هەموو گەردوون لە خۆتدا دەبینی، مانگ مەمکی چەپتە و خۆر مەمکی ڕاستت و پووزی سپیت ڕووبارەکان.

شانازی بە قژی درێژتەوە ناکەیت. شانازی بە لووتەوانە و پاوانەکانتەوە ناکەیت، کە دەکرێ پیاوێک دوانزە کاتژمێر بیری لێ بکاتەوە. ناز بەسەر ڕێگەکاندا ناکەیت. منەتی جوانیت بەسەر ژیاندا ناکەیت، مرۆڤ لەنێو تۆدا چەکەرە ناکات، شانازی بە ورگی زلتەوە ناکەیت. دەبینیت ڕامین، ژنبوون چەند جوانە.

ژنان هەمیشە جیاوازن لە پیاوان، حەزیان لە سەرکێشی هەیە، حەز لە شتی سەیر دەکەن، دەیانەوێت هەموو شتێک تاقی بکەنەوە، هەندێکیان هەرگیز ناتوانن پیاو وەکوو هاوسەرێک ئاسوودە بکەن. هەرگیز نایانەوێت ببن بە هی کەس. هەرگیز نایانەوێت بچنە ژێر کۆنترۆڵی هیچ کەسەوە، بۆ نموونە، دایکت.

حەوا سێوەکەی خوارد، نەک لەبەر ئەوەی نەیتوانی بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ بێت، بەڵکوو دەیویست یاخی بێت لەو یاسایەی خودا بۆی داناوە. دەیویست تاقیکردنەوەی هەبێت. نەیویست لە چوارچێوەی یاسایەکدا بژی. ژنان هەرگیز حەز لە یاساکان ناکەن. ئەگەر بۆیان بکرێت، هەمیشە یاساکان دەشێوێنن. من هەمیشە ناکۆکیم لەگەڵ یاساکاندا هەیە، یاساکانی مرۆڤ، یاساکانی گەردوون، یاساکانی ژیان. حەزم لە ژیانی دووبارە و سەفەری دووبارە و تەنانەت سێکسی دووبارەش نییە.

بۆچی دەبێ یەکی مانگ، هەر یەکی مانگ بێت؟ بەدرێژاییی ژیان، شەو تاریک بێت؟ دەمەوێت بزانم ئەگەر تاریکی نەبێت، بە چیدا بوونی شەو دەسەلمێت؟ خۆر بۆچی هەمیشە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵبێت؟ یان

هەرگیز بوونەوەری هەسارەیەکی تر لێرە نابینین؟ بۆچی هەرگیز ڕۆژێک سندوقی پۆستەکەمان، یان ئیمەیلەکەمان نامەیەکی تێدا نییە، لە ئەستێرەیەکی ترەوە؟ تەماشا بکە ڕامین، ئەم ژنە دەیەوێت هارمۆنیای سروشت بشێوێنێ.

دایکان زۆر حەز دەکەن کچەکانیان لە خۆیان بچن، بەڵام من هەرگیز حەز ناکەم خوشکەکەت لە من بچێت، چونکە سەرکێشی سەرئێشە دروست دەکات.

هەرگیز نامەوێت بنووسێت. کاتێک خولیای نووسین لە مێشکیدا چەکەرە دەکات، ئیدی دەبێت بیر لە تێکچوونی ڕەوتی ژیانی ئاسایی بکاتەوە.

ژنێکی نووسەر هەرگیز ناتوانێت لە چوارچێوەی ژیانێکی هاوبەشدا بمێنێتەوە، جا ئەگەر ئەو ژیانە هاوبەشە هاوسەرگیری بێت، ئەوا کەسی بەرامبەر یان دەبێت تەسلیمی خەیاڵی شێتانەی ئەم بێت، یاخود دەبێت بەدبەخت بێت. بەگشتی، هاوسەرگیری قووڵترین گۆڕە بۆ مرۆڤ.

ژنە نووسەرەکان، تەنانەت خواش گیری خواردوە بەدەستیانەوە.

لەم کۆمەڵگەیەدا، دەبێت جەنگاوەرێکی ئازا و شارەزا بیت، ئەگەر یەکێک لەم سێ کەسایەتییەت هەبێت: ژن بیت، جوان بیت، بەهرەیەکی جوانت هەبێت. شەڕی گەورە ئەو کاتە دەست پێ دەکات، لە یەک کاتدا هەرسێکیان بیت.

ڕامین، ئەگەر ورد لە هاوکێشەکە بڕوانیت، ڕەنگە تۆش وەکوو من بەو دەرئەنجامە بگەیت، کە ژن و پیاو، نێر و مێ، لە ئەزەلەوە هەردووکیان یەک توخم بوون، ئێمە لە یەک جەستەدا هەم ژن بووین هەم پیاو، بە فیتنەی ئاشووبگێڕان بوو، یان ڕێکنەکەوتنی خۆمان بوو، ئەوەیان نازانم، بەڵام لە ناوەڕاستدا کراین بە دوو بەشەوە، بووین بە

دوو کەرتی جیاواز، بووین بە دوو ڕەگەز. شەو دروست کرا، تاریکی خولقێندرا لەپێناوی ئەوەی مرۆڤ بەدزی چاوی ئاشووبگێڕانەوە هەردوو ڕەگەزەکەی پێکەوە گرێ بداتەوە، هەموو دینەکان هەر یەک بەپێی یاسای خۆی نزا دەکا و دوو ڕەگەزەکە لە یەک نزیک دەکاتەوە، مرۆڤ ئاهەنگ بۆ بوونەوەبەیەکی ژن و پیاو دەگێڕێت. ئێمە بۆ بوونەوەمان بەیەک، هەمیشە هەوڵی دوورینەوەمان دەدەین، لەژێر ناوی هاوسەرگیریدا کۆ دەبینەوە، هەمیشە جووت دەبین، دەچینە ناو یەکترەوە، نەوە لەدوای نەوە دەخەینەوە، کەچی هێشتا نەمانتوانیوە ببینەوە بە یەک ڕەگەز. نەمانتوانیوە بگەینەوە بە یەکبوونە جەوهەرییەکە. نەمانتوانیوە لە یەک جەستەدا کۆ ببینەوە. نەمانتوانیوە لەژێر یەک پێستدا بجووڵێین. ئێمە وەک بادەمێک لە ناوەڕاستدا کەرت کراین، هەر لەبەر ئەم دابەشبوونەیە، کە ژیان بەبێ یەکێک لەم دوو ڕەگەزە بەردەوامی نابێت.

ئێستا تێدەگەیت ڕامین، ئێمە هەر یەک چ کەرتێکی بادەمەکەین؟

بە هەرحاڵ، پزیشکەکە هەواڵی کوڕبوونی تۆی پێ ڕاگەیاندم. من و تۆ ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر هاوڕێیەتیمان پتەو دەبوو. من ژنێکی تەنیا بووم. خامۆشی و چۆڵیی ناوەوەی من، وەک کڵێسایەکی کۆن و پەراوێزخراو هەستی پێ دەکرا، بەڵام دروستبوونی تۆ لەناو مندا، خەریک بوو لەو تەنیاییە دووری دەخستمەوە. هەمیشە هەستم دەکرد مرۆڤێک لەگەڵمدایە. لەگەڵ تۆدا منداڵ دەبوومەوە، دەمویست درک بەو کاتە بکەم، کە لەژێر پێستی دایکمدا وەک کرمێکی بێ دەست و پێ دەجووڵامەوە. تۆ جەستە و تەنیاییت ئاوەدان کردمەوە.

بەردەوام قسەم بۆ دەکردیت، باسی شێوەی تێڕوانینی خۆم، خولیاکانم، چۆڵی و خامۆشیم، . ئەو شتانەی هەرگیز لای هیچ کەس نەمدەوتن بۆ تۆم باس دەکرد. من لەو کەسانەم، کە کەمترین کات قسە

دەکەم، حەز دەکەم نهێنیم هەبێت. ڕامین، با هەمیشە لە ژیانتدا نهێنیت هەبێت، چونکە نهێنییەکان وا لە مرۆڤ دەکەن، زیاتر لەگەڵ خۆیدا بێت و زیاتر چێژ لە پێکەوەبوون و دانیشتن لەگەڵ خۆیدا وەربگرێت، چێژ لە دۆستایەتیکردنی خۆی ببینێت. نهێنییەکان مرۆڤ قەرەباڵغ دەکەن بە خۆی. زۆربەی زۆری مرۆڤەکان دەور دراون بە قەرەباڵغی و هەراوزەنا و خۆشیان غائیبن لە خۆیان. تۆ لەخۆتەوە نزیک بە، دۆستی خۆت بە، چونکە هەندێک جار ئەوەی لە دەرەوەی خۆت ئەگوزەرێت، یەک پارچە فەوزا و ئەنارشیەتە. زۆر گرنگە لەگەڵ خۆتدا دابنیشی، لە خۆت دوور نەکەویتەوە، بیری خۆت بکە و تەنیاییت قەرەباڵغ بکە بە خۆت. تۆ قەت هەبووە لە خۆشەویستیدا بیت لەگەڵ خۆتدا؟ من زۆر جار لە خۆشەویستیدا بووم لەگەڵ خۆم. نهێنییەکانت خۆش بوێ و بیانپارێزە، هەندێک نهێنی هەن، پێویستە لە خودی خۆشمانی بشارینەوە.

تۆ تەنیاییت ئاوەدان کردمەوە، چەندین باس و خواسم لەگەڵ تۆدا تاووتوێ دەکرد، هەزارەها گەرد و خۆڵی نێو ژیانم دەخستە ڕوو. ڕۆژنامە و کتێبم بە دەنگی بەرز دەخوێندەوە، تا تۆ بتوانی لەودیو ئەو پەردە تەنکەی سکمەوە، کە لە نێوانماندایە، گوێت لێم بێت. مەودای دووریی نێوان من و تۆ، تەنیا ئەو پێستە تەنکە بوو. پێکەوە گوێمان لە میوزیک دەگرت، هونەرمەندەکانم پێ دەناساندیت، پاڵەوانی فیلمەکان، ئەڵبەت هەموو ئەو شتانەی خۆم حەزم لێ دەکردن، دەمویست تۆیش حەز لە هەمان ئەو شتانە بکەیت. بۆ نموونە، حەزت لە گوێگرتن لە داریوش و دیاری و مەزهەر و کەمەندی و فەتانە و لارا بێت. ناچارم دەکردیت لەو کاتانەدا بنوویت، کە من دەمویست. هەندێک جار بە تۆخی بێدەنگی و گوێگرتن لەدەنگی تەپەتەپی پێی پیاوێک، کە هۆکاری گرێدانی من و تۆ بوو پێکەوە.

حەزم دەکرد حەزت لە شیعرێک بێت، کە من چێژم لێ دەبینی، ئاڵ

هیچ

هەڵووژە ترشانە بخۆیت، کە من دەمخواردن. حەزت لەو لیمۆیانە بێت، کە زمانیان هەلاهەلا دەکردم. زۆر چێژم لەوە دەبینی، کە دەمانتوانی ڕۆژی دوو ژەم پێکەوە نان بخۆین. مەودای دووریی نێوان تۆ و ئەم دونیایە، تەنیا پێستێکی تەنک بوو، پێستێکی تەنک.

# ١١

بەڕاستـ... ببـوورە پشـيلە بچكۆلەكـەم، لـە سـەرەتاى دروستبوونتدا، زۆر بێزارم دەكرديت بـە خواردنـى هەڵووژە ترشـە سـەوزەكان و خواردنى ليمۆ و گێلاسـەكان. خەيالْم دەمبات بۆ ئـەو كاتـە...

لەسـەر كارەكەمـم، زەرفێك هەڵووژەى ترشـم لەسـەر مێزەكەم داناوە، زووزوو دانەيـەک دەر دەهێنـم و دەيخـۆم، مراجعـەكان دەميان پڕ دەبێت لە ئـاو، كاتێكيش فەرمووويـان لـێ دەكـەم، مووچوڕكێكى دەستكرد لە خۆياندا دروسـت دەكـەن. بەڕێوەبەرەكـە تۆمەتبـارم دەكات بـەوەى كاتێك من دەبينێت، ددانـى جيڕ دەبێتـەوە.

گێـلاس و ليمـۆ و هەڵـووژە خـواردن دەبێـت بـە پيشـەى مـن. باوكت پێـى وايـە لەبرى تـۆ، گێلاسـێكم دەبێـت. لـە پاسدا هەڵوژە دەخۆم و چاوم چكۆلـە دەكەمـەوە، شـۆفێرەكە لـە ئاوێنەكـەوە تەماشـام دەكات، هەڵە تێدەگات و دەسـت بـە قژيـدا دەهێنێـت. بـە پيـادە دەڕۆم، جارجـار هەڵووژەيـەک لە جانتاكـەم دەر دەهێنـم و دەيخـۆم، دواتـر ناوكەكـەى دوور هەڵدەدەم، بەو مەبەستەى بڕوێت و ئەگـەر تـۆ كچ بوويت، دووگيان بوويت، بێزووت بە هەڵـووژەوە كـرد، لێـى بخـۆيـت و چاوەكانـت بچـووک بكەيتـەوە، شـۆفێرى پاسـەكە دەسـت بـە قژيـدا بهێنێـت. دڵـم بـە ئەگـەرەكان خۆشـە، دەخـوازم دونيا پڕ بێت لـە دارى هەڵـووژە.

# ١٢

بەدیار تیڤیەوە بۆ تاوێک لەسەر قەنەفەکە خەون دەمباتەوە...

(بەفر دەبارێت، خەڵکی دەیانەوێت تۆڵەیەک بکەنەوە. نەنکم شۆربای قارچکی دروست کردووە. لە کوخێکی تەختەداین، تەنیا یەک شەمع داگیرساوە. گوێم لە دەنگی شکان و لێکترازانی سکڵی ئاگردانەکەیە.

لەم تاریکییەدا، تەنیا دەمی تیژی چەقۆکان دەبریسکێنەوە. ژیان بەستوویەتی.

ئەسپەکان دەحیلێنن، گورگەکان دەلوورێنن. نەنکم دەڵێت:

«ڕەنگە گورگ تەواوی مرۆڤایەتی لەناو بەرێت، ڕەنگە بەفرەکە خۆش نەکاتەوە...»

هانیکۆ دەبینم لەناو بەفرەکەدا دوای کەروێشکێک دەکەوێ و بۆی ناگیرێت. ئاوڕ دەداتەوە. بڕیارە پێم بڵێت (دایکە) و نایڵێت. بڕیارە توند باوەشم پێدا بکات و نایکات. بڕیارە بڵێت خۆشم دەوێیت و نایڵێت... بڵێت، ژیان خەریکە گورگ دەیخوات. دایکە، پەشمەکەکەم لێ دەستێنن).

ئەم بڕیارانە تەنیا پێشبینیی مێشکی پووتی منن. ئەم وشانە خواستی منن و هەرگیز لای ئەو جێبەجێ ناکرێن. ئەو تەنانەت لەخەونەکانیشدا

لێم هەڵدێت.

خەبەرم دەبێتەوە، دەموچاوم تەڕ بووە. دەمەوێت دووبارە بنووم و بە هەمان ئەو ڕێگەیەدا بڕۆم، کە لێوەی چووم بۆ لای هانیکۆ، بەڵام ناتوانم. نەنکم دەڵێت:

«خودا بەخێری بگێڕێت.»

پێکەنینم بەو قسەیە دێت. نزاکان ناتوانن چارەسەرێک بدۆزنەوە و هیچ بگۆڕن. لەوەتەی من هەم، نەنکم لەسەر بەرماڵە، نیوەی تەمەنی لەسەر ئەو پارچەقوماشە بەسەر برد، کەچی ڕۆژێک نەمبینی تارمایی باپیرم بگەڕێتەوە، ڕۆژێک نەمبینی من سەلار بم. هەتا ئەو زیاتر نزام بۆ بکات، لاسار تر دەبم.

باوەڕم بە دایکیشم نەماوە، جاران تەنوورەیەکی سووری کورتی لەپێ دەکرد، ئێستا تەنیا دەموچاوی دەبینم.

پێم باش نییە سنووری پارچەقوماشێک بکەم بە شوێنێک بۆ پتەوکردنی پێوەندیی نێوان خۆم و خودا، مەگەر هەموو جێگەیەکی ئەم گەردوونە هی خودا نییە؟ چ جیاوازی هەیە من لە هەرکوێ بم و بەهەر جلوبەرگێکەوە بم؟ بۆچی دەبێت خودا من بە داپۆشراوی ببینێت، ئەو کاتەی لەگەڵیدا دەدوێم؟ مەگەر خودا مەحرەم نییە؟ مەگەر ئەو بە قورەکەی دەستی هەموو پێکهات و ئەندامەکانی جەستەی منی بە وردبینییەوە دروست نەکردووە؟ مەگەر منی بە ڕووتی دروست نەکردووە؟ مەگەر بەر لە هەرکەس، ئەو جەستەی منی نەبینیوە؟

پێوەندیی نێوان خودا و مرۆڤ، پێوەندییەکی ڕۆحیی هەمیشەییە، ناتوانرێت سنووردار بکرێت و کات و شوێنی بۆ دیاری بکرێت. هەر ئەوەی کەماڵێک جودا کراوەتەوە و تایبەت کراوە بە خودا و پەرستنی خودا، بۆخۆی جێگەی پرسیارە. ئایا دەکرێت ماڵێک بوونی هەبێت بۆ

خودا؟ مەگەر خودا خاوەنی هەموو گەردوون نییە؟ خوداوەند پێویستی بە حەجکردن و بوغوردسووتاندن و مۆمداگیرساندن و چوونەکڵێسا و بەرخسەربڕین و هتد. نییە، بە بڕوای من، دەکرێت هەموو مرۆڤێک خاوەنی دینی تایبەت بە خۆی بێت، هەرکەس شێوازی تایبەت بە خۆی هەبێت بۆ پەرستن، بۆ نموونە، دەکرێت ڕامان بەدیار گوڵێکەوە و وردبوونەوە لە جوانییەکانی و سوپاسگوزاربوونی دروستکەری گوڵەکە و بە ڕەگ و قەد و گەڵاکانیدا ڕۆچوون و شۆڕبوونەوە بۆ قوڵایی دروستکەر، بۆخۆی پەرستنێکە. دەکرێت لە ڕێگەی ئەو گوڵەوە یان لە ڕێگەی کەروێشکێکەوە یان چۆلەکەیەکەوە، یان لە ڕێگەی ئاسمانەوە یان ئینجانەیەکەوە دەنگمان بە خودا بگات. واتا لە هەرجێگەیەک جوانی هەبوو، دەکرێت لە ڕێگەی ئەو جوانییەوە ئێمە دەنگمان بە خودا بگات، یان لە ڕێگەی ئەو جوانییەوە خودا ببینین و بیپەرستین، یان ڕەنگە خودا خودی جوانییەکە بێت، هیچ جیاوازییەک نییە لەوەدا، کە جێگەی خودا پەرستی مزگەوت یان کڵێسا و پەرستگا بێت. مەبەستەکەم ڕوونە؟ من هێشتا لەگەڵ هیچ کام لە ئایینەکاندا یەکلا نەبوومەتەوە، بەتەواوی بەو دەرئەنجامە گەیشتووم، کە مرۆڤایەتی زەلیلی دەستی دینە.

هاوڕێیەکی چەپم، کە باوەڕی بە بوونی خودا نەبوو، ڕۆژێک بینیم نوێژ دەکات. پرسیارم لێ کرد چۆنە وا نوێژ دەکات، چی گەیاندوویەتی بەم باوەڕە؟ ڕاستەوخۆ وەڵامی دامەوە، کە باوەڕی بە بوونی خودا هێناوە. مەبەستی قسەکەی من ئەمەیە، ئایا ئەگەر کەسێک باوەڕ بە بوونی خودا بهێنێ، مەرجە ڕاستەوخۆ دەست بە نوێژ بکات و دینی ئیسلام هەڵبژێرێت؟ ئەو هاوڕێیەم بێ لێکدانەوە و پێداچوونەوە و پشکنینی دینەکانی تر، ڕاستەوخۆ لە قووڵایی دینی ئیسلامدا خۆی بینییەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، زۆربەمان دین و زانست و دونیابینییەکانمان لەسەر بنەمای کولتوور و ئەو زنجیرە

نەبچڕاوە هەڵدەچنین، کە لە باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە، نەک لەسەر ئەزموون و بیر و بەرکەوتنی خۆمان. هەڵبژاردنی دینەکانیشمان هەر لەو سۆنگەیەوەیە هەر بە لەدایکبوونمان بێ لێکدانەوە، هەست دەکەین تاکە ڕێگە بۆ گرێدانمان لەگەڵ خودا، دینی ئیسلامە. ئەمە لای کەسێک کە مەسیحیش بێت، هەر هەمان شتە، کە پێی وایە دینی مەسیح ڕاسترین دینە. دەبێت مرۆڤ خۆی بەدوای ڕاست و دروستیی دینەکاندا بگەڕێ، خۆی بەریان بکەوێ و لەو سۆنگەیەوە بڕیار بدات، کە ڕەنگە تەواوی دینەکان نەتوانن قەناعەت بە مرۆڤ بکەن، هەروەها دەکرێت تۆ سەر بە زۆربەی دینەکان بیت و زیاتر لە دینێکت هەبێت. دەکرێت لە هەر دینێکدا کۆمەڵێک جوانی هەبن ڕامان کێشن. یانی هیچ نەنگییەکی تێدا نییە تۆ سەر بە هەموو ئایینەکان بیت، دەکرێت تۆ بۆ مانگێک ببیت بە یەهودی (جوو)، یان مەسیحی (کریستیان)، یان زەردەشتی... هتد. دەشکرێت هیچ دینێک تۆ تێر نەکات، وەک وتم، خۆت خاوەنی دینی خۆت بیت. تۆ خاوەنی ڕۆحیت، کەواتە خۆت خاوەنی دینی خۆت بە، خودا بەشێک لە خۆی لە تۆدا داناوە.

ئەگەر بزانرایە خوداوەند لە جێگەیەکە، ئەوا بێگومان مرۆڤ ڕێگەی دەگرتە بەر و دەچوو بۆ لای، بۆ نموونە ئەگەر بوترایە خودا لە هەسارەی زوهرەیە، مرۆڤ ڕێگەی ئەوێی دەگرتە بەر، بەڵام لە ڕاستیدا، خوداوەند لە هیچ شوێنێک نییە، جگە لە ڕۆحی مرۆڤەکان.

جیاکردنەوەی دینەکان و دروستبوونی کوتلەی ئاینی، دەستکردی خودی مرۆڤە.

هەندێک کەس تەنیا کێشەی لەگەڵ بوون و نەبوونی خودادا هەیە، بێئاگا لەوەی ئاڵۆزییەکە لەدوای ئەو باوەڕەوە دەست پێ دەکات، قورسییەکە لەوێدایە، کە چ دینێک شایانی پراکتیزەکردنە.

دڵنیام تۆ لە کەشوهەوایەکی خنکاودا پەروەردە دەبیت، بەڵام تکات لێ دەکەم، لەم بابەتەدا خۆت بڕیار بدە و مەچۆرە ژێر کاریگەریی بڕیاری هیچ کەسێکەوە. بە ئەقڵی خۆت باوەڕ بە شتەکان بکە و لەپێناوی باوەڕتدا هیلاک بە. باشتر وایە پشت بە ئەندێشەی خۆت ببەستی، نەک پاڵ بەو دیوارەوە بدەیت، کە باووباپیران و چەندین نەوە پێش تۆ بێ دڵنیابوون و زانینی چۆنیەتی دروستبوونی دیوارەکە، پاڵیان پێوە داوەتەوە. تۆ شێوازی دروستبوون و پێکهاتە و ماددەکانی ناوەوەی بپشکنە و ئەگەر دڵنیا بوویت بەڕاستی دەتوانیت پاڵی پێوە بدەیت، ئەوسا بە ئیسراحەت پاڵ بەرەوە. یان ڕەنگە لە دواجاردا بتەوێت خۆت دیوارێک دروست بکەیت. لە ژیانتدا خۆت بە، لەوانی تر مەچۆ، خۆت بە، بە هەموو ناشرینی و تایبەتمەندییەکانتەوە.

دەچمەوە سەرەوە. هەندێک کەرەوز دەبەم بۆ کەروێشکەکەم، کە لەژێر چەرپاکەمدا شاردومەتەوە. تەماشا بکە ڕامین، من چەند خۆپەرستم، ئەو کەروێشکە بەستەزمانەم لە جێگەیەکی داخراودا قەتیس کردووە. من جیهانی ئەوم لەم جیهانە بچووکەی خۆمدا بچووک کردۆتەوە. سێلیم دێت و لە پەنجەرەکەوە خوارەوەم پێ پیشان دەدات و دەڵێت، «پشیلەکە بەچکەی کردووە.»

دەبینم دوو-سێ شتی چکۆلەی سووری ناشرین دەوریان داوە. چاوم زەق دەبێت، دڵم پڕ دەبێت، ڕقم لە پشیلەکە دەبێتەوە، ئەویش بوو بە دایک؟ سێلیم داوام لێ دەکات بە نەنە نەڵێم، چونکە ئەگەر بزانێ نایەڵێت لەمماڵەدا بژین. بە ژوورەکەدا دێم و دەچم، پاشان بە ڕاکردن دەچمە خوارەوە.

«نەنکە، پشیلەکە لە حەوشە بەچکەی کردووە»

نەنکم دەنگێکی بەرزی لێوە دێت و بەرەو حەوشەکە دەڕوات. خیانەتم

لـە سـێلیم کـرد، خیانەتـم لـە پشـیلەکە کـرد. دەڕۆمـە ژوورەکـەم، دەرگاکە دادەخـەم.

ئێمـە هەمووما‌ن خیانەتکارین. پشیلەکە خیانەتی لـە مـن کـرد، تەنیاییمی جێ هێشـت. مـن خیانەتـم لـە سـێلیم کـرد. مـن و باوکیشـت خیانەتمان لە یـەک دەکـرد، بیـرم دەکەوێتـەوە...

# ١٣

بە ژمارەیەکی نەناسراو نامە بۆ باوکت دەنێرم، خۆمی لێ دەگۆڕم. ڕۆژەکانم بەوە بەسەر دەبەم. باوکت پێم دەڵێت:

«کارم زۆرە، باشترە خۆت بڕۆیت بۆ سەفەر.»

دەزانم کارە گرنگەکەی، منەکەی ترە، کە مەسجم بۆ دەنێرێت. دەچمە چێشتخانەکە و نامەی بۆ دەنێرم، چاوم لێیە بەدزی منەوە وەڵام دەداتەوە. دێمەوە ژوورەوە.

دەڵێت:

«بڕۆ بنو، من نانوم تەماشای یاریی ڕیاڵ مەدرید و بەرشەلۆنە دەکەم.»

لەسەر چەرپاکە بەسەر دەمدا دەکەوم، دڵداری لەگەڵ باوکتدا دەکەم.

پێم دەڵێت، «ژنەکەم نوستووە. ژنەکەم زۆر دوورە لێم...»

ڕاست دەکات، من و ئەو تەنیا یەک دیواری نێوان ژوورەکان لە نێوانماندایە، بەڵام چەند سەدەیەک لە یەک دوورین، ڕەنگە ئەو چەند سەدەیەک بەر لەمن بژی.

باوکت خەریکە لەگەڵ منەکەی تردا دەکەوێتە خۆشەویستییەوە.

کۆچەر ئەبوبەکر

مرۆڤێکی سۆزدار و عاشق لەودا دەر دەکەوێت، کە من تا ئێستا نەمناسیوە و درکم پێ نەکردووە. غیرە لە خۆم دەکەم، لە منەکەی تر، کە دڵی باوکتی بردووە. ئیرەیی بە دیوەکەی تری خۆم دەبەم، دەمەوێت قژی دەر بهێنم. حەز دەکەم بەردەوامی هەبێت، ڕەنگە ئێمە لە دوورەوە بتوانین یەکترمان خۆش بوێت، پێوەندییەکان لە دوورەوە و نەناسراوانە جوانترن.

داوای بینینی لێ دەکەم، ئاوێنە بەر ناکەوێت، لە هەموو ئاوێنەکاندا سەیری خۆی دەکات. بۆن و بەرامەی لە حەوت گەڕەکی ئەودیومانەوە هەست پێ دەکرێت.

## ١٤

ڕامینی دایە... هیچکات بیرت لەوە کردۆتەوە ببیت بە نووسەر؟ کێ دەڵێت لە کاتی خوێندنەوەی ئەم نامەیەدا، تۆ نووسەر نیت؟ من ناتوانم و نامەوێت هیچ دەستێکم هەبێت لە بەدیهێنان، یاخود گۆڕینی حەزەکانتدا، چونکە دواجار، تۆ گەورەبوویت و ئەو منداڵە بچکۆلەیە نیت، کە من لێت دەڕوانم. ئەوەی هەر لە منداڵیتەوە هەستم پێ کردووە، ئەوەیە کە ڕەنگە تۆ ببیت بە نووسەر. تۆ کەسێکی بێدەنگیت، زۆر لە شتەکان ڕادەمێنیت، پرسیاری گەورەتر لە خۆت دەکەیت. هەمیشە لە کتێبخانەکەدا دەستکاری کتێبەکانت دەکرد و دواتر وەکوو خۆی دات دەنانەوە. باڵات نەدەگەیشت بە تەواوی کتێبەکان، تەنیا نهۆمی یەکەمی کتێبخانەکەت دەبینی، کاتێکیش تەماشای کتێبەکانت دەکرد، زۆر بەجوانی پەڕەکانت هەڵدەدانەوە، وەکوو مرۆڤە گەورەکان. ئێستا وێنەیەکت لە بەردەستمدایە لە تەمەنی دوو ساڵیدایت، چاویلکەکەی باوکت لەچاو کردووە، کتێب دەخوێنیتەوە و دەمە بچکۆلانەکەت دەجووڵێنیت. منیش بەدزییەوە وێنەم گرتویت. تەنیا بزانە کە نووسین ماددەیەکی هۆشبەرە، ناتکوژێت، بەڵام وات لێ دەکات هەتا ماویت پێوەی بناڵێنی، لەپێناویدا شەڕ بکەیت، هەرگیز نەتوانیت وازی لێ بهێنیت.

ئەوە بزانە، دایکت نووسینی لە هەردووکتان خۆشتر ویست، ئەمە دانپێدانانێکی زۆر قورسە بۆ من وەکوو دایکێک، بەڵام ناچارم دانی پێدا بنێم. من لەپێناوی نووسیندا توانیم واز لە ئێوە بهێنم، بەڵام لەپێناوی ئێوەدا نەمتوانی واز لە نووسین بهێنم، هەرگیز وەسوەسەی نووسین وازی لێ نەهێناوم و وەکوو ژەنگێک خواردوومی، ڕەنگە نەفرەتم لێ بکەیت، ڕەنگە بە جۆرێکی دی وەری بگریت و خوێندنەوەی بۆ بکەیت، بەڵام دڵنیام، ڕۆژێک لەم هەستەی دایکت تێدەگەیت. تێدەگەیت ژنێک لەبری قاپوقاچاخی گرانبەها، کتێب لەناو کەوانتەرەکەیدا هەڵبگرێت، چۆن گیرۆدە بووە، بەتایبەت ئەگەر ببیت بە نووسەر، تێدەگەیت نووسین چ ئالوودەبوونێکە. هەتا نەبیت بە نووسەر، زەحمەتە لە تەرزی بیرکردنەوەی من تێبگەیت. نووسین ئازارێکە، ئازارێکی خۆش. نووسین دووکەڵی ناوەوەی مرۆڤە.

نووسین هاواری ناوەوەیە، هاواری وجودە.

تۆیش هاوڕای لەگەڵ من؟ تۆیش پێت وایە نووسین ژەهرێکە؟

جارێکیان سەوزەفرۆشێک لێی پرسیم، چۆن دەکرێت نووسەر بیت و خانوویەکت نەبێت؟

لە وەڵامدا بە پێکەنینەوە پێم وت، ئێمە بازرگانی مرواری نین، بەڵکوو نووسەرین... نووووسەر!

ڕامین، زۆر حەزم دەکرد کچێکی گوندنشین بوومایە، ئەوسا تەنیا خەونی من قژداهێنان و بەرئاوێنە و بینینی یارەکەم دەبوو، چێژم لە سپیکردنەوەی قاپەکان دەبینی. حەزم لە ئاوڕشێنکردن و گسکدانی سەکۆی ئێوارانی هاوین دەبوو. بەیانیان کومبارەکانم دەتەکاند... ژیانم دەتەکاند و بە لارولەنجە دەچووم بۆ مەڕدۆشین...

منیش هەندێک جار شتی خەیاڵی دەڵێم ها!

رامین، زانین مرۆڤ گیرۆدە دەکات، مرۆڤ هەتا زیاتر بزانێت ئازاری، زیاتر و فراوانتر دەبێت. دڵنیاش بە، مرۆڤ تا کەمتر بزانێت، کەمتر لێی بترسە، چونکە تا زیاتر بزانێت، زیاتر دەبێت بە دڕندە.

تەنیا ئەوەندە بزانە، من پێم خۆش نییە ببیت بە کەسێکی سیاسی و وەکوو پیاوێکی سیاسی ڕەفتار بکەیت، چونکە هەندێک لە پیاوە سیاسییەکان، گورگێکی برسین بۆ دوو شت، (ئافرەت و کورسی)، هەندێک لە پیاوە سیاسییەکان ئەوەندە بچووک و شل و ناکامڵن، ژنێک بەئاسانی دەتوانێت وەکوو قوڕێکی دەستکرد لە دەستەکانیدا یارییان پێ بکات و چی بوێت ئەوەیان لێ دروست بکات. هەندێکیشیان وەکوو مارمێلکەیەکی قێزەون دەبینم، بڕێکیشیان وەکوو ئەسپێک یان پڵنگێکی، یان وەکوو چۆلەکەیەکی جوان. هەندێکیان مەخلوقی جوانن. پیاوەکان جۆریان زۆرە، دڵنیام لەگەڵ گەورەبوونتدا، جۆری پیاوەکان دەناسیت. گرنگیشە لەناو هەموو جۆرە پیاوەکاندا، جۆری خۆت بناسیت.

ڕام، بیرت دێت هەموو جارێک پێم دەوتیت هەرگیز ژێردەستەیی قبوڵ مەکە؟ ئێستایش دووپاتی دەکەمەوە. من دەبوو یان ژێردەستە بم و ئێوەم هەبێت، یان دەبوو یاخی بم و ئێوەم نەبێت، یاخیبوونم هەڵبژارد. من هەرگیز دڵێکم ناوێت قەفەس بێت، ئومێدمە لەمە تێبگەیت.

# ١٥

کاتی لەدایکبوونی تۆ نزیک بۆتەوە. زیاتر لە هەرکاتێکی دی، حەزم لە پیاسەکردنە، زیاتر لە هەرکاتێکی تر، نیگەرانم. نامەوێت تۆ بێیتە دەرەوە و لێم دوور بکەویتەوە. بێیتە دەرەوە، ئەم ژیانە ببینیت. هەمیشە پرسیارت لێ دەکەم:

«لە کێ دەچیت؟ من یان باوکت؟»

«ئایا تۆش دەبیت بە پیاوێک لە پیاوەکانی ئەم کۆمەڵگەیە؟»

«تۆش بەدیار یاریی ڕیاڵ و بەرشەوە بەدزی ژنەکەتەوە نامە بۆ دیوەکەی تری هاوسەرەکەت دەنێریت؟» ئەگەر وا بکەیت تووڕەم دەکەیت، ها...!

بەڵام تۆ دواجار کوڕی ئەم کۆمەڵگەیەیت، ناتوانم بڵێم وەکوو پیاوی ئەم کۆمەڵگەیە بیر مەکەرەوە، ئەوە بۆ خۆت جێ دەهێڵم.

ڕۆژ دوای ڕۆژ، ترسی لەدایکبوونت لە مندا گەورەتر دەبێت. ترس لەوەی کە تۆیش دووبارەی پیاوەکانی تر بیت. ترس لەوەی بۆ هەمیشە لە مندا بێیتە دەرەوە، لەوەی لێم دوور بکەویتەوە.

سکم زۆر گەورەتر بووە لەوەی چاوەڕوانم دەکرد. دەچم بۆ پشکنین،

ئیدی ناچارم لە ڕیزەکەدا بوەستم. خواردنیشم زۆر زیاتر بووە بە بەراورد لەگەڵ جاراندا، وەکوو مرۆڤە زۆر قەڵەو و ورگزلەکان خۆم دێتە پێش چاو، کە تەنیا بیر لە خواردن دەکەنەوە. پێچەوانەی جاران، کە هەمیشە ئاگادار دەبووم تا کێشم زیاد نەکات. مەمکەکانم وەکوو بەرد ڕەق بوون، پڕن لەخۆراکێک، کە لە ڕۆحمەوە بۆ تۆ دروست کراون.

هەینێ خۆم دەکێشم، زۆر دڵخۆش دەبم بە زیادبوونی ڕۆژ لەدوای ڕۆژی کێشم، چونکە بەم جۆرە، دڵنیا دەبمەوە لە گەشەکردنی باشی تۆ. بەتەواوی ڕادێم لەگەڵ دە کیلۆ لە بەردەممدا. تێدەگەم ژیان عادەتێکە، دەتوانین بە هەموو جۆرێک خۆمانی لەگەڵدا ڕابهێنین. تێدەگەم ژیانکردن بووە بە خوویەک. وا هەست دەکەم زەوی لەناو سکمدایە و من بە زەوی دووگیانم.

لەو ڕۆژانەدا کە چاوەڕوانی هاتنی تۆم، هیچ نانووسم، لەگەڵ ئەوەی زۆر تەنیام، کاتیشم زۆرە، بەڵام هەمیشە بیرم قاڵە بەوەی ڕۆژێک ناچار دەبیت بەجێم بهێڵیت و سەفەرەکانت بە هاتنەدەرەوەت لە من دەست پێ دەکات.

ڕامین، من کاتێک چاوم کردەوە، لە جلوبەرگێکی سپیدا بووم، لە ئاهەنگی خۆمدا خۆمم بینییەوە، بەتەنیشتی پیاوێکەوە دانیشتووم، کە کۆمەڵێک دیواری کۆنکرێتی لە نێوانماندا بوونیان هەیە. ڕەنگە منیش هەمان شت بووبم بۆ باوکت، ئێمە، من و باوکت، دوو منداڵ بووین کۆنترۆڵەکانمان بە دەست گەورەکانەوە بوو. ڕیزی هەڵپەڕکێ بازنەیەکی داخراوی بەدەوری دونیا تازەکەمدا دروست کردبوو، ئەوە نیشانەی سەرەتای قفڵبوون و بچووککردنەوەی دونیای من بوو، ئەگەر دەتەوێت دەربارەی ناسینی من و باوکت بزانیت، باشترە لە باوکت بپرسیت.

مرۆڤ هەندێک جار بڕیاری زۆر لە خۆی گەورەتر دەدات، هەندێک

جار هەڵەیەک دەکات، ناچارە تا دواساتەکانی ژینی باجی ئەو هەڵەیە بدات. جار هەیە کەسانی تریش ناچارن باجی هەڵەکەی ئەو بدەن، وەک چۆن من و باوکت هەڵەمان کرد و ئێستا تۆ و خوشکەکەت لەگەڵماندا باجەکەی دەدەن. تۆ لە ئەنجامی شەڕێکی گەورەی نێوان من و باوکتەوە هاتیتە بوون... جەنگی گەورەی ژێر پێخەفەکان!

من شەش ساڵی تەمەنم خراپ ژیام، تەواوی تەمەنیشم خراپ دەژیم، چونکە باجی ئەو شەش ساڵە دەدەم، مرۆڤ بە بچوکترین هەڵە، ساڵەکانی ژیانی لەبار دەچن.

باوکت منی خۆش دەویست، بەڵام نەیدەزانی چۆن خۆشی دەوێم، گرنگە کاتێک کەسێکت خۆش دەوێ، جۆری خۆشویستنەکە دەستنیشان بکەیت، چۆن و بۆ خۆشت دەوێ؟ هەر لەو سۆنگەیەوە مامەڵە لەگەڵ دۆخەکەدا بکەیت. ئەمە کێشەی زۆربەی زۆری مرۆڤەکانە. گرنگە بزانیت ئەو هێزە موگناتیسیە چییە لە کەسێکدا، تۆ ڕادەکێشێت، بۆ ئەوەی جوولەکانت بەرامبەر ئەو نارێک و خواروخێچ نەبن. هەرگیز ناتوانین ڕابردوویەک، کە لێی پەشیمانین، بگۆڕین. پێشنیار دەکەم تۆ هەرگیز وەها هەڵەیەک نەکەیت. هەرگیز بڕیارێک مەدە پێشتر بەوردی بیرت لێ نەکردبێتەوە. هەرگیز خۆت وابەستەی شتێک، کەسێک مەکە، کە لە دڵەوە وابەستەی نەبیت.

# ١٦

چاوم لێتە بنێشتەکەت لە دەمی بچکۆلەت دەر دەهێنی و لەسەر قووتووی شەکرەکە دای دەنێیت. پێت دەڵێم:

«شەکر نەخۆیت.»

ژوورەکە جێ دەهێڵم، بەدوامدا دێیت، دەبینم دەستێکت لە پشتەوەت حەشار داوە. پێم دەڵێیت:

«دایکە، شەکرم پێ نییە.»

«ئەگەر پێت بێت، زویر دەبم هاااا!»

لە زویربوونم دەترسیت، دەچیت شەکرەکە فڕێ دەدەیت، بنێشتەکە دەخەیتەوە دەمت.

من لە نێت خەریکی گەڕانم بۆ ڕێنماییییەک، بۆ ئەو دایکانەی بەدەست دوو منداڵەوە گیرۆدە دەبن.

گێلاسێکی تر لە سکمدایە.

«دایکە، کەی خوشکەکەم دێتە دەرەوە؟ دایکە پێم وتی دەبێت هەر ناوی بنێیت هانیکۆ.»

«یاری بە بنێشتەکەت مەکە.»

«دایکە... من جوانم یان هانیکۆ؟»

وەڵام نادەمەوە، ئەو پرسیارە وەڵامەکەی ئاسان نییە.

«من ئازام یان بۆقەکان؟»

«من پیاوم یان حاجی مەجید؟»

هەڵدەستم، لە بەردەم پەنجەرەکەدا دەوەستم، دەست بە پشتمەوە دەگرم و تەماشای دەرەوە دەکەم، تۆیش تەپلەکێک دەهێنیت و دەچیتە سەری، تا بتوانی دەرەوە ببینیت. دەمم لە پەنجەرەکە نزیک دەکەمەوە، بە هەڵمی دەمم تەمێک لەسەر پەنجەرەکە دروست دەکەم، ورگم بەر پەنجەرە ساردەکە دەکەوێت. بە هەڵمی پەنجەرەکە دەنووسم ڕامین، دەیسڕمەوە، دەنووسم مانگ، دەیسڕمەوە، وێنەی دڵێک دەکێشم، تۆیش وەکوو من دەکەیت، دوو-سێ خەت دەکێشیت. پێدەکەنم و توند باوەشت پێدا دەکەم.

دەمەوێت تۆیش بخەمە لای خوشکەکەت و بۆ هەمیشە لەناو خۆمدا بەندتان بکەم. ئەوەندە توند باوەشم پێدا کردوویت، هاوارت لێ بەرز دەبێتەوەو دەڵێیت

«ئاخخخ!»

# ١٧

ئێوارە سوور هەڵگەڕاوە، دونیا زۆر ساردترە لەوەی من چاوەڕوانم دەکرد. ئاسمان بۆنی بەفری لێ دێت. دەبوو خۆم باشتر بپێچایەتەوە. هەردوو دەستم دەخەمە بنباڵم و لە ڕیزەکەدا دەوەستم، ورگم وەکوو تەپڵەکێک لە بەردەممدا وەستاوە. دونیا خەریکە تاریک دادێت.

«خانم سەرەم نەهات؟»

«یەک نەفەرت لە پێشەوەیە.»

بێتاقەت دەبم، ئەڵقەی زەرفێکی گەورەم کردۆتە قۆڵم، پڕە لەو جلوبەرگانەی لە ڕێگەی هاتنمدا بۆ ئێرە بۆم کڕیویت. بیر دەکەمەوە، دەبێت خانمی پزیشک چیم پێ بڵێت؟ دەزانیت ڕامین، ئەوەندەی بیستبێتم، ئەو ساتانە بۆ دایک زۆر خۆشە، چونکە بڕیارە ئەوەی لە ناویدایە بێتە دەرەوە، ئەو هاوڕێیەی کە نۆ مانگ چاوەڕوانی دەبیت، ئەو میوانەی بەر لە نۆ مانگ هاتنی خۆی ڕادەگەیەنێت، دەڵێت ئامادەکاریم بۆ بکەن.

دایکم دەڵێت بەر لەوەی من لەدایک بم، بە مانگێک نەیتوانیوە شەوان لە خۆشیدا بنوێت، بەڵام من وا نەبووم. من زۆر نیگەران و دڵشکاو بووم، دڵم پڕ بوو، دەمویست بقیژێنم و بڵێم:

تكایـە مەیـەرە دەرەوە، چونكـە ئـەم ژیانـە شـایانی ئـەوە نییـە لەپێناویدا ئـەو هێمنییـەی نـاو سـكی منی بـۆ جـێ بهێڵێت.

ئامـادە بـووم بـۆ هەمیشـە بـە ورگـی زلـەوە بمێنمـەوە، ئامادەبووم هەمیشـە لەسـەر خۆراكی جەسـتە و ڕۆحـم بژیت، بـە مەرجێك، تۆ نەیەیتە دەرەوە.

ڕامیـن، ژیـان دروسـت وەكـوو شـەمەندەفەرێك وایـە، هەمـووان تێیدا سەرنشـینین، هەندێـك هـەن فارگۆنێكـی تایبـەت بـە خۆیـان گرتـووە، هەیـە كورسـییەكی بـەر كەوتـووە، هەیـە لـە هەڵگـری خەڵووزەكەدایـە، هەیـە شـۆفێرەكەیە و لە پێشـەوەی شـەمەندەفەرەكەدایە، بەڵام دواجار، هەموومان لەنـاو شـەمەندەفەرەكەداین، شـەمەندەفەرەكەش بەردەوامـە لـە ڕۆیشتن. تۆ هێشـتا سـواری شـەمەندەفەرەكە نەبوویت، ڕەنگـە هەفتەیەكی دی یان هـەر ئێسـتا، سـواری شـەمەندەفەرەكە ببیـت، یـان ڕەنگـە لـە نـۆ مانـگ بـەر لـە ئێسـتاوە، سـواری بووبیـت. تـۆ لێـرە دەبیـت و سـەردانێكی زەوی دەكەیت. ئەڵبـەت بـە جەسـتە، چونكـە ڕۆح نەمـرە. دەكـرێ لـە دەرەوەی ئێـرە چەندین جـۆر ژیانـی دی بوونیـان هەبێـت و ئێمـە بـە چەندەهـا جـۆر ژیابێتین، ئەكرێ ئەزموونـی چەندیـن جـۆر ژیانمـان كردبێـت. دەكـرێ ڕۆحـی هەریـەك لـە ئێمـە بەسـەدان سـاڵ لـە گەشـتدا بێـت. ڕۆح ڕەهایـە.

لـە شـوێنێكدا خوێندمـەوە، فریشـتەكان بۆیـە هەرگیـز نامـرن، چونكـە جەسـتەیەكی دیاریكراویـان نییـە، لەمـەوە بـەو ڕاسـتییە دەگەیـن، كـە جەستە ژیانـی هەمـوو مرۆڤێـك سـنووردار دەكات و بچووكـی دەكاتـەوە. تـۆش پێت وا نییـە؟

تـۆ قـەت پرسـیوتە بۆچـی منداڵێـك كاتێـك دێتـە ئـەم ژیانـەوە، ناتوانێت قسـە بـكات و هیـچ شـتێكیش دەربـارەی ئـەم دونیـا تازەیـەی نازانێـت؟ لەبەر ئـەوەی سـفر كراوەتـەوە لـەو ژیانـەی بـەر لـە هاتنـی بـۆ ئێـرە، تێیدا ژیاوە.

ئەمەش یارییەکە لەگەڵ ڕۆحی ئێمەدا دەکرێت. ڕۆحمان بەردەوام لە سەفرکردنەوەدایە، بۆ ئەوەی نە لێرە دەربارەی دونیای بەر لە هاتنمان بۆ ئێرە بزانین، نە لەپاش ڕۆیشتنمان لێرە، بیری ئێرەمان هەبێت. ئێمە قودرەتی بیرچوونەوەمان هەیە، ئەمەش بۆخۆی حیکمەتێکە، چونکە ئەگەر بیرچوونەوە نەبوایە، هیچ جۆرە ژیانێک تەحەمولکراو نەدەبوو. پێم سەیرە مرۆڤانێک دەبینم، بە جۆرێک لە جۆرەکان خۆیان بۆ جیهانێکی تر ئامادە دەکەن، جیهانی پاش ئێرە، جیهانی پاش مەرگ. وەک ئەوەی خەریکی زەخیرەخستن بن. ئایا بەر لە هاتنیشمان بۆ ئێرە، بە هەمان شێوە خەریکی خۆئامادەکردن بووین بۆ ئێرە، تا بەباشی بژین؟ ئایا زەخیرەمان هەبووە بۆ ئێرە؟ ئەگەر وا بێت، ئەوا جۆری ژیانمان و باش و خراپیی ژیانمان پێوەندیی بە کەم و زۆریی زەخیرەکە و باشی و خراپیی خۆئامادەکردنەکەمانەوە هەیە. تۆش پێت وا نییە؟

کوڕی دایە، ئەم ژیانەی ئێستا من تێیدا بۆ تۆ دەنووسم، دروست وەکوو ئەوە وایە ڕۆژێک سەردانی شاری یاری یان باخچەیەکی ئاژەڵان، یان گوندێکی بچوکۆلە بکەیت و پاش بەسەربردنی ڕۆژێک، جێی بهێڵیت. ژیان هەم کورتە، هەم وەک چۆنیەتی بەسەربردنی ڕۆژێک وایە لەو باخچەیەدا. دەکرێت بۆ هەندێک زۆر خۆش و چێژبەخش بێت و لە ئێوارەدا نەیەوێت بڕواتە دەرەوە، پاسەوانەکە بەزۆر بیکاتە دەرەوە، بۆ هەندێکیش بە پێچەوانەوەیە. لە هەردوو بارەکەدا، کۆتاییی ڕۆژەکە هەر دێت و تەواو دەبێت. ژیانی ڕاستەقینە لە دەرەوەی ئەو باخچەیەدایە، لە دەرەوەی ئەو ڕۆژەیە، لە دەرەوەی ئەو گوندەیە، کە دەکرێت چەندین شار و ڕۆژی تر هەبێت و ئەزموونی چەندین جۆری ژیانی تر بکەیت لە دەرەوەی ئەم ژیانە، دەشکرێت بە چەندین کاراکتەر و بە چەندین شێوە و جەستەوە بێینەوە ژیان. دەکرێت من هەمان ڕۆحی کیلۆپاترا یان نەفرتی تی بم لە جەستەیەکی نوێدا و لە سەردانێکی نوێمدا بۆ زەوی.

دەکرێت تۆش ڕۆحی هیتلەر یان سوقرات بیت، کێ دەزانێ؟ با کورتتر تێت بگەیەنم. وای دانێ ژیان باخچەکەی ماڵی نەنکتە و ڕۆژێک سەردانی دەکەیت. مردنیش ئەوەیە تۆ لە ئێوارەدا لە دەرگاکەوە دەچیتە دەرەوە، یان ڕێک وەک ئەوەی تۆ لە ژوورێکەوە دەچیت بۆ ژوورێکی تر، لەمە زیاتر نییە. ژیانی تۆ، خودی باخچەکە نییە، بەڵکوو ئەو ڕۆژەیە، کە تۆ لەوێدا بەسەری دەبەیت. دەکرێت چەندین ڕۆژی تر و بە چەندین شێوەی تر، سەردانی بکەیتەوە. کاتێک تۆ لەو باخچەیەدا دارێک دەچێنیت، ئەو کاتە تۆ ناوت بۆ چەندین مانگ، ساڵ یان دەیە یان سەدە دەمێنێتەوە، ئەوەیان پێوەندیی بە جۆری دارەکە و شێوازی ڕواندنەکەوە هەیە. شتێک لەوێدا نوێنەرایەتی تۆ دەکات. هونەرمەندان و نووسەران و فەیلەسوفەکان و... هتد. ئەوانەن کە ناویان دوای خۆیان زیندووە و دەمێنێتەوە. ئەوانەن کە دارێکیان چاندووە. مەبەستمە پێت بڵێم، مرۆڤ پێویستە وەها بژی، کە مرد مرۆڤایەتی زەرەری گەورە بکات. دروست وەک مردنی ئەدۆنیس، یان سوقرات، یان مەولانا.

«خانم، سەرەی تۆیە، فەرموو.»

دەچمە ژوورەوە، خانمی پزیشک پێشنیار دەکات پاڵ بکەوم، تا پشکنینم بۆ بکات. ئامێری پشکنینەکە بە سکمدا دەهێنێ، لە ساردیدا ڕادەچڵەکم.

«کچم، وەک پێشتر پێم وتوویت، تۆ دەبێت بە نەشتەرگەری سیزیریان ئەم منداڵەت ببێت، چونکە منداڵیت و ناتوانیت بە شێوەیەکی ئاسایی منداڵت ببێت. منداڵەکەت هەفتەیەکی دی کاتی لەدایکبوونییەتی، پاش هەفتەیەکی دی، هەر لەم ڕۆژەدا کە دووشەممەیە، دووبارە سەردانم بکە و شەوەکەی نەشتەرگەریت بۆ دەکەم.

بە دیوارەکەوە وێنەی ژنێکی دووگیان هەڵواسراوە، دەستی خستۆتە سەر سکی و لە ناوی ناوەوەی دڵییەوە پێدەکەنێت. وا دەزانێت هەموو

بوون و زەوی و گەردوون لەژێر دەستی ئەودایە.

«خەڵکی چۆن دەتوانن ئەوەندە دڵخۆش بن؟ ئەوەندە سادە بن؟»

لەسەر مێزەکەی خانمی پزیشک نەخشەی زەوی وەکوو تۆپێکی خڕ دانراوە. بیر دەکەمەوە، تۆش دەبیت بە بوونەوەرێک لەناو ئەم تۆپە خڕەدا.

هەڵدەستم و بە کلینکسێک سکم دەسڕم. باوەڕ ناکەم تۆ تەنیا هەفتەیەکت مابێت لە مندا، ئەمە ئازارم دەدات. بەر لە هاتنەدەرەوەم، بە سەری پەنجەکانم خولانەوەیەک بە نەخشەکەی گۆی زەوی دەکەم، لەمسەری زەوییەوە دەبیەم بۆ ئەوسەر. بە شەقامی ئۆرزدیدا دێمە خوارەوە. دونیا تاریک بووە، کەشەکە زۆر ساردە، باران هێواش دەبارێت. گڵۆپەکان دونیایان ڕووناک کردۆتەوە، خەریکە شەقامەکە چۆڵ دەبێت، هەر عەرەبانەیە شتەکانی دەپێچێتەوە، هەر دەڕابەیە دادەدرێتەوە، هەر تاکسیە ڕادەگیرێت. وا هەست دەکەیت خەڵکی ئێواران زیاتر لە هەرکاتێکی دی، سەرگەرمی ژیانن، پەلەپەلییەکی سەیر و جموجۆڵێکی سەیر ڕوو دەدات، بە جۆریک، وا هەست دەکەیت لە ئێوارەدا ژیان بریتییە لە پەلەپەلییەکی گەورە، یان ئەگەر لە ئێوارەدا مرۆڤەکان نەچنەوە ماڵەوە، کارەساتێک دەقەومێت. دەست دەخەمە سەر سکم و بە چرپە پێت دەڵێم:

«کوڕم، چاو لەم جەنجاڵییە بکە و مەیەرە دەرەوە.»

بە ڕاستەوخۆیی ببینە، ئەمە جیهانی دەرەکییە، جیهانی دەرەوەی من، جیهانی ناو تۆپە خڕەکە.»

هێندە دڵم پڕە، کە دەمەوێت کەمێک بە پیاسە بڕۆم. پێویستم بە هەوای ئێوارە هەیە، بەڵام کات درەنگە، ناچار تاکسیەک دەگرم و دەگەڕێمەوە ماڵەوە. شۆفێرەکە سەیرێکی سکم دەکات و دەپرسێت:

«ماشەڵڵا، زۆر منداڵیت، چۆن وا زوو شووت کردوە؟»

لە ئاوێنەکەوە تەماشایەکی دەکەم، مۆرەیەکی لێ دەکەم. دەست بە پێکەنین دەکات.

دەگەمە ماڵەوە و بە باوکت ڕادەگەیەنم، هەفتەیەکی دی دەبێت بە باوک. ئەو بەو هەواڵە شاگەشکە دەبێت. ئەو لە گۆشەنیگای منەوە سەیری ئەم هاتنەی تۆ ناکات، ئەو وەکوو من بیر ناکاتەوە. ئەو دڵنیایە لەوەی هەرچی ڕوو بدات، تۆ لەو دوور ناکەویتەوە، چونکە ئەو باوکە.

پیاو لە یەک کاتدا دەتوانێت لە دە ژن و منداڵی هەبێت، بەڵام ژن ساڵی یەک جار چانسی بوونبەدایکی هەیە، ئەویش لەدوای تەمەنی چل ساڵییەوە، ئەو چانسەشی نامێنێت. بەڵام پیاو تا کۆتایی تەمەنی، دەتوانێت تۆوی خۆی بەناو هەموو ژنەکانی زەویدا بڕێژێ و مرۆڤایەتی پڕ بکات لە هاوشێوەکانی خۆی. یەک پیاو لە توانایدا هەیە بەشی شارێک نەوە بخاتەوە و هاوشێوەی هەبێت. بوونی ئەوان واتا بوونی مرۆڤایەتی، پیاوێک بە بەراورد بە ژنێک، زۆر زیاتر دەستی لە گەشەسەندنی مرۆڤایەتیدا هەیە. دەتوانین بوون و بەردەوامیی بەشێکی ژیان ببەستینەوە بە بوونی ئەوانەوە. پیاوەکان بوونەوەری جوان و لە هەمان کاتیشدا ناشرینن. تۆ سەیر بکە ڕامین، دڵی بەردی ئەوان توانیی دەیان ژن سەرگەردان بکات. وای کرد ژنان ببن بە هەزار پارچەوە، وایان کرد ژن لە جەستەی خۆی ببچڕێت و ژیان دروست بکات. ئەوان حەوایان بۆ ناو یارییەکە پەلکێش کرد، دڵی ڕەقی ئەوان دەتوانێت وا بکات، ژنێک تا بەیانی خەون بە جلی بوکێنییەوە ببینێت، ژنێک، خوێن لە مەچەکی بهێنێت. ژنێک، ئاگری خۆش بوێت. دەتوانێت وا بکات ژنێک مووروو و مێخەک و گەردانەکانی بپارێزێت. ژن لەپێناوی ئەواندا ببێت بە ژن. دەتوانن وابکەن ژنێک شانزە کاتژمێر لەبەر ئاوێنەدا خۆی بابدات. یەک سەدە دوودڵ بێت لە هەڵبژاردنی بۆنەکەیدا. کل و کلدانی خۆش

بوێ. دەبینی ڕامین، پیاوەکان چ کەرتێکی سێوەکەن؟

باوکت و خاڵت بەدیار یاریی دووگۆڵییەوە دانیشتوون

«بەس ڕۆناڵدۆ ئەم یارییە بباتەوە، کوڕەکەم بە ناوی ئەوەوە ناو دەنێم.»

من لە ژووری نووستنەکە ئەو جلانەی بۆم کڕیویت، ڕێکیان دەخەم و دەیانخەمە لای جلەکانی دی. لەناکاو هەست بە تەڕی دەکەم، تەڕییەکی سەیر. دەترسم، بانگی باوکت دەکەم و دۆخەکەی تێدەگەیەنم. پێم دەڵێت:

«پێویستە بچین بۆ نەخۆشخانە.»

بەنیازە بچێت خۆی بگۆڕێت، دەستی دەگرم و دەڵێم:

«نا، دکتۆرە وتی هەفتەیەکی ماوە.»

«نابێت، هەر دەبێت بچینە لای پزیشک.»

جانتایەکی بچووک دەهێنم و هەرچی جلێک بەدەستمەوە بێت، بۆی دەئاخنمە جانتاکەوە. دەڕۆمە دەرەوە، خاڵت دەیەوێت لەگەڵماندا بێت، دادەنیشم و دەڵێم:

«تۆ بێیت، من ناچم.»

قەمسەڵەکەی خۆی دادەکەنێت و دەیدات بەسەر شانمدا.

«خۆزگە تۆ ئەوەندە ئینکار نەدەبوویت، ئێستا وەختی ئینکارییە؟»

باوکت پێی دەڵێت:

«لێی گەڕێ، تۆ لەماڵەوە بە، هەرچی بوو، ئاگادارت دەکەمەوە. ئەنجامی یارییەکەم بە نامەیەک بۆ بنێرە.»

دەمەوێت هەتا هێزم تێدایە، بە جانتاکەی دەستم یەک دانە بکێشم بە پەناگوێیدا. لەناکاو دەرگای حەوشەکە دەکرێتەوە و یەک جەماعەت خۆیان دەکەن بە ژووردا، ماڵی نەنکت بەکۆمەڵ هاتن، دیارە باوکت پێی وتوون.

نەنکت دەڵێت:

«کچم، چیتە؟ یەڵڵا خێرا کەن، شت بپێچنەوە، هیچت بیر نەچووە؟»

بە باوکت دەڵێت:

«ناسنامەکەت بیر نەچێت، داوامان لێ دەکەن. پارەی زۆریش هەڵبگرە، کارگوزارەکان بۆ کوڕ داوای بەخششی زۆر دەکەن.»

دەڵێم:

«خۆتان تێک مەدەن، من هیچ ئازارم نییە، ئێستا دێینەوە، پزیشکەکە هەفتەیەکی تری بۆ داناوم.»

دەچینە نەخۆشخانەکە، هەموو شتێک بە پزیشکەکە دەڵێم. پەرستارەکان لێم کۆ دەبنەوە، چانسم هەیە، لەو شەوەدا منداڵبوون کەمە.

«وەی کە منداڵیت...»

«منداڵ نیم، خۆم وا دەر دەکەوم.»

«تەمەنت چەندە؟»

«کەی شووت کردووە؟»

«چەند خۆشە بە منداڵی ببیت بە دایک.»

ئەم پرسیارە پووچانە لای خاوەن بڕوانامەکانیش بوونیان هەیە.

دکتۆرەکە دەڵێت:

«ئامادەی بکەن بۆ نەشتەرگەری.»

یەکێک لە کوڕەکان دەڵێت:

«ئەگەر کچ بوو، دەبێت بیدەیت بە من.»

«باشترە چاوەڕوان نەبیت، چونکە کوڕە.»

پێکەنینم دێت. باوەڕ ناکەم منداڵم ببێت، چونکە هیچ ئازارم نەبوو. تۆ

تەنانەت لەو کاتەیشدا ئازاری دایەت نەدا.

یەکێک لە پزیشکە کوڕەکان باوکت بانگ دەکات، دەست دەخاتە سەر شانی و قسەی بۆ دەکات. کاغەزێک دەخاتە بەردەستی، باوکیشت تەماشایەکی من دەکات، کەمێک دەوەستێت، پاشان کاغەزەکە واژۆ دەکات. نازانم چی بە باوکت وتووە، بەڵام باوکت دڵی پڕ بوو و بەپەلە چووە دەرەوە، تا من هەست بە شڵەژاوییەکەی نەکەم، نەنکیشت بەدوایدا دەڕوات.

«دەستتم بدەرێ.»

«نا، تکایە کانولام بۆ دامەنێ ، زۆر لێی دەترسم.»

«مەترسە، ناهێڵم ئازاری هەبێت.»

«بەڵێن؟»

پێدەکەنێ و دەڵێت:

«بە مەرجێک، دەبێت پاکەتێک شیرینیم بۆ بکڕیت، بەڵام لای کەس باسی نەکەیت.»

« ئۆکەی»

بەرەو ژووری نەشتەرگەری دەچم. باوکت وەستاوە و چاوی سوور بووە. نەنکت دەگری و خێر قەرار دەدات. پوورت دڵی پڕ بووە. دەپرسم:

«ئەوە چی بووە؟»

وەڵام نادەنەوە.

نازانم بۆ هاتنەکەی تۆ بوو یان بۆ دڵپڕییەکەی باوکت، یاخود بۆ تەنیاییی خۆم بوو؟ چاوم تەڵخ بوو، بەوەدا زانیم دەمەوێت بگریم. بۆ شاردنەوەی گریانەکەم، ڕوو دەکەمە پەنجەرەکە و سەیرێکی دەرەوە دەکەم. ئاسمان ئەوەندەی تر سوور بووە. پێم وا بێ ئەویش وەکوو من

چاوەڕوانی لەدایکبوونی بەفر دەکات و بە ژانەوەیە. سەیرێکی دەستەکانم دەکەم، ڕاستەوخۆ ئەوە بە مێشکمدا دێت، کە دوای چل ساڵی تر، دەستەکانم بە دەسکی پەنجەرەکانەوە چرچ دەبن.

دەچمە ژووری نەشتەرگەری، پزیشکەکە پێم دەڵێت:

«کچەکەم، ترست نەبێت، تەنیا یەک کاتژمێری دی، تۆ دەبیت بە ژیکەڵەترین دایک.»

لە پەرستارێک دەپرسم:

«کاتژمێر چەندە؟»

«دەو چل خولەک.»

دوو جۆر دەرزی تێکەڵ دەکەن و شلەیەک لە ڕێگەی کانولاکەوە بە جەستەمدا بڵاو دەکەنەوە.

دەمەوێت لە دکتۆرە بپرسم:

«دەکرێت کارێک بکەیت بۆ هەمیشە لەناو مندا بمێنیتەوە؟»

ناتوانم لێوەکانم بجووڵێنم و ئەوە بڵێم. سەیری سەقفەکە دەکەم، دەخوولێتەوە، دونیا دەخولێتەوە. دکتۆرە سەرەوخوار دەبێتەوە. منداڵیم دەبینم لەسەر جۆلانەیەکە و دایکم بەتیژی پاڵی دەنێت. سەرم بەرز کردۆتەوە، ئاسمان لەگەڵمدا جۆلانە دەکات. باوکم لەسەر پشکۆ تەماتە دەبرژێنێت. خاڵت چیلکەیەکی کردۆتە نێوانی پەنجەکانییەوە، لاسایی باپیرە دەکاتەوە. نەنکم خەریکی چنینی لفکەیەکی زبرە، تا ڕووخساری ژیان بەجوانی پاک بێتەوە. باپیرە سەبیلەکەی پڕە لە مەراق، داوا دەکات قۆرییەک ئاسوودەیی بخەینە سەر پشکۆکە. من لەسەر جۆلانەکەم خۆم خستووە بە پشتدا و قاچم درێژ کردۆتەوە، ئاسمان بەسەر سەرمەوە هاتووچۆیەتی، هەندێک جار سەرم دەگاتە لای ناوکی و دواتر دەموچاوی دێتەوە بەردەمم.

# ١٨

کاتژمێر نزیکی یەکی نیوەشەوە، ئێستا لە ئارایشتگە گەڕاومەتەوە. بەپێی وتەی فریشتەکانی مزگەوت و زمانحاڵەکانی خودا، سبەی جەژنە. دڵم هێندەی ژوورەکەی مام نوری تەنگە. دایکم دڵی بە گۆڕینی پەردەی ماڵەکە و کڕینی گوڵدانەکان و شوێنی چوکلێتەکان خۆشە. پوورت هێشتا نەنووستووە، بە تەشتێک ئارایشتەوە لەبەر ئاوێنەکەدا خۆی بادەدات، بڕیارە سبەی خۆشەویستە بەویقارەکەی ببینێت. من لەسەر قەراغی چەرپاکەم ماندوو دانیشتووم و خۆزگە بە سادەیی ئەوان دەخوازم. بیر دەکەمەوە، دونیا... ببورە جلەکانی بەرم بگۆڕم. بیر لە گەمژەیی خەڵک دەکەمەوە، کە تەنیا لە جەژندا خۆیان بیر دەکەوێتەوە. ڕامین، زۆر گرنگە مرۆڤ گرنگیی بە خۆی بدات، جەستە و ڕووخساری خۆی خۆش بوێت و خزمەتی بکات. ئێمە ئەگەر خۆمان خۆش نەوێت، چۆن بتوانین کەسانی دیمان خۆش بوێت. هەندێک ژن دێنە لام لە ئارایشتگە، سوێند دەخۆم بە پیرۆزییەکانم لە جەژنی پارەوە دەستکاریی خۆی نەکردووە. دروست وەک ئەوە وایە، پیاوێک بێتە لام و دواتر وەکوو خانمێکی شۆخ بچێتە دەرەوە. ئەم خەڵکە تەنیا لە جەژندا ورگیان و هاوسەرەکانیان و ماڵەکانیان و تەنانەت خۆیشیان بیر دەکەوێتەوە. ئێستا لە هەرکاتێکی

دی، دڵم بۆتان تەنگ بووە. کەس بیر لە من ناکاتەوە، کەس بیر لە منداڵەکانی من ناکاتەوە. کەس نایەوێت لەوە تێبگات، شکاندنی دڵی دایک پەنجەرەیەک نیە و دواتر بە خەمیر شووشەیەکی تری تێ بکەیت. ئەگەر بۆم بکرێت، بەم شەوە بەسەر دارتێلەکانیشدا بێت، دێم بۆ لاتان، تەنیا بۆ ئەوەی لەژێر جێگەکەتانەوە بۆنتان بکەم. دەشتەکان کاکیبەکاکین. شار تەنیا لە دوورەوە جوانە. وەک ئەوە وایە باڵەخانەکان لەسەر دڵی من دروست کرابن. شار هیچ کەسی تێدا نییە وەکوو ئێوە لە ڕەگەزی گوڵ. شار خێرنەدیوێکە، وەکوو من.

ڕۆژگار لە من ناڕوات، دەستەسڕەکە لە سەلیم وەردەگرم و پەنجەرەکان دەسڕمەوە، کات تێپەڕ نابێت. ژمارەیەکی نەناسراو بێزارم دەکات. پەنجەرە دەبێت بە ئاوێنە، دەتوانم لە پەنجەرەکەدا تاڵە هاتووەکانی برۆم ببینم، توندتر پەڕۆکەی پێدا دەهێنم. میللی کاتژمێرەکە لە شوێنی خۆیەتی. چیمەنتۆی حەوشەکە هەڵی دا، ئەوەندە خشەخشم لێ هەستاند. نەنکم بۆڵەی دێت: .

«پوورە خشێ ئاوی لە تەنکیی سەربانداا نەهێشت.»

ددانەکانم ڕەش بوونەوە، ئەوەندە قاوەم خواردەوە. قژ نەما لە بەردەستمدا سەقەتی نەکەم و دواتریش ئاوێنەکە نەدەمە دەستی. زاوا نەما قوڕ نەکەم بە سەریدا و بوکی بە تەشتێک گەچکارییەوە بۆ نەنێرمە پەردەوە. خۆ بەم حاڵەی کە هەشمە، ناتوانم هیچ بخوێنمەوە. زەنگی مۆبایلەکەم بێزارم دەکات، ژمارە و مرۆڤی نەناسراو بێزارم دەکەن.

لە کۆڵان شەق لە تۆپی منداڵەکان هەڵدەدەم.

«بە نەفرەت بن!»

دەمەوێت بچێت بۆ ئەوسەری زەوی. دەمەوێت گوڵ لە خودا بکەم. هەست دەکەم قووتوویەکی بەتاڵم و قاچەکانی ڕۆژگار بەدەم پیاسەوە

شەقم تێ هەڵدەدەن، خۆیشم نازانم دەمدەنە دەمی کامە توولەڕێوە.

ئێرەیی بە بۆقەکان دەبەم. ئێرە سەر زەمینی بۆقەکانە، ئەوان هەمیشە زمان لە ژیان دەر دەهێنن و جڕت بۆ ڕۆژگار دەکێشن. پیرەکچەکەی دراوسێمان پێم دەڵێت، هەموو هەینییەک بوغوردم بۆ دادەگیرسێنێ و لە مزگەوت بە پیرێژنەکان دەڵێت، دوعا بۆ ژنێکی تەنیا بکەن، خودا ڕەحمی پێ بکات.

ڕامین، تازە زانیومە خەڵکیش هەست بەو وێرانییەم دەکەن.

لە ئاوێنەکاندا تۆ دەبینم یان قژی لوولی خوشکەکەت.

شەوەکان بێ ئێوە، تاریکی دەست لە ڕۆحم گیر دەکات. چەندە پێویستمە لەگەڵ ئێوە لەسەر گەلایەک لە دوورترین زەمین سەوز بژیم.

کاتێک ئێوە لێرە نین، هیچ شتێک ڕەنگ و بۆی ڕاستەقینەی خۆی وەرناگرێت، هیچ شتێک ناتوانێت خۆشی بە دڵدا بهێنێت. پرتەقاڵ تامی نەوت دەدات. پەتاتە بە خەیاڵی کێوییەوە دەخۆم، شووتی تامی ئاو دەدات. شاتوو تامی خەیار دەدات. گێلاس ڕەنگی باینجان وەردەگرێت. لە فیلمەکاندا هەموو گریانێک دەبەستمەوە بە دووربوون لە منداڵەکانەوە. وا هەست دەکەم گۆرانییەکان بۆ دووریی من لە ئێوە وتراون.

بارانێک لەناو مندا ئامادەیی هەیە. لە پەنجەرەکەوە دونیا دەبینم، ئاسمان سوورە، قەڵەمتۆزەکە خۆی بادەدات. ڕەشەبا هەڕەشەیەک دووپات دەکاتەوە. دڵم دەڵێ ئێوە سەرماتانە. لە پەنجەرەکەوە پشیلەکە دەبینم بە زمان دەستی تەڕ دەکات و دەیهێنێت بە دەموچاویدا، بەم نیوەشەوە چاوپێکەوتنی لەگەڵ دڵدارەکەیدا هەیە. ئەمجارەش سکی پڕ دەبێ و نەنکم دووبارە شاربەدەری دەکات. شکور ئەویش بێچووەکانی جێیان هێشت.

# ١٩

دەزانیت ڕامین، ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ هەرگیز باوەڕ ناکەم، لە کاتژمێر شەشی بەیانییەوە بەخەبەرم. بڕیارە باپیرت تۆ و هانیکۆ بهێنێت.

ماڵی نەنە زۆر قەرەباڵغە، خاڵە ماڵی باپیرت، واتە ماڵی باوکی من و ماڵی پوورەکانت، هەروەها چەند کەسێکی تری بانگهێشتی نانی ئێوارە کردوە، بڕیارە مەراسیمێکی بچووک بۆ هاتنی ئێوە ساز بکرێت.

جێ بە خۆم ناگرم، بەرامبەر بە کاتژمێرەکە دادەنیشم و زووزوو دەڵێم:

«دایکە، ئەو کاتژمێرە کار ناکات.»

«کار دەکات، تۆ کاتت لێ ناڕوات.»

دەڕۆمە دەرەوە، چاوێک بە کۆڵانەکەدا دەگێڕم و دێمەوە. سەری مەنجەڵەکان هەڵدەدەمەوە، دێم و دەچم، پەنجەی دەستم دەتەقێنم. بە محاجەرەی پێپلیکانەکاندا خلیسکێنە دەکەم. خۆم بە شانی خاڵەدا هەڵدەواسم. پڕبەدڵ پێدەکەنم، پێکەنینم بەوە دێت، کە پێدەکەنم. سەیر کە، مرۆڤ چەند ئاسان پێدەکەنێت و چەندە ئاسان دڵخۆش دەبێت. لیمۆ لەسەر لیمۆ کون دەکەم و ئاوەکەی دەمژم. بە پەنجەی دەستم قژم لوول

دەکەم، بە بڕبەنەکە نینۆکم ڕێک دەکەم.
«خاڵە، بۆ نەهاتن؟ گرەو دەکەم ئەو کاتژمێرە باترییەکەی کۆن بووە.»
سێلیم بە سینییەک شەربەتەوە دەچێت بۆ لای میوانەکان، ختووکەی دەدەم، پەرداخەکان نیوە دەبن.
«نەنکە... پێم بڵێ بۆ کات ناڕوات؟»
پوورت کەرەوز چاک دەکات. چڵێک هەڵدەگرم و دەڵێم:
«کەرەوز تەنیا کلکەکەی خۆشە.»
وەکوو منداڵ دێم و دەچم، نەنکم دەڵێت:
«بسرەوە، دەڵەیت کرمت تێدایە.»
«نەنە، نازانێت ئەمڕۆ چ کرمێکم تێدایە.»
خوشکەکەم پشتئەستوور بە ئەزموونی ڕابردوی، بە ئاماژەی دەستەکانی مەنجەڵەکانم نیشان دەدات، دەڵێت:
«دەبێ مەنجەڵەکان سێ-سێ لە گەورەوە بۆ بچووک لەسەر یەک دابنێین، بەم جۆرە تێدەگەین کابانی ماڵ چەندە بەسەلیقەیە.»
بیر دەکەمەوە لە ژیانمدا بیرم لە ڕیزکردنی مەنجەڵ بە شێوەیەکی ئەندازەیی نەکردۆتەوە.
جەڕەسی دەرگایە، بە ڕاکردن بەرەو دەرگاکە دەڕۆم، پێم لە ماسیحەکەی سێلیم هەڵدەکەوێت، هەمووان بەرەو لام دێن.
«هیچ نییە، باشم.»
دەرگای حەوشەکە دەکەمەوە، لوقمی خێرە.
«ئۆففف... خوا قبوڵی نەکات.»
بە دڵشکاوی دێمەوە، لەسەر پێپلیکانەکان دادەنیشم و دەست بە قاچی ڕاستمەوە دەگرم و بە دەنگی بەرز دەگریم. ئازاری قاچم دەکەم بە

بیانووی گریانەکەم. مرۆڤ چەند ئاسان دەخرێتە گریان. خاڵم دەڵێت:

«چی بوو دیسان؟»

«قاچم شکا.»

خاڵە سەیرێکی پێیەکانم دەکات و دەڵێت:

«گەورە بیت لەبیرت دەچێتەوە.»

لەبەر خۆمەوە دەڵێم:

ئەم ئازارە لەگەڵ گەورەبوونمدا گەورە دەبێت، تا گەردوون بمێنێ، بیر ناچێتەوە.

هەڵدەستمەوە، ڕەشی بە چاومدا دێتە خوارەوە. بۆ لای پەنجەرە هەڵمگرتووەکە دەچم. پەنجەرەکانیش وەکوو دڵی من هەڵمی چێشتەکان گرتوونی. دەچمە سەر کەوانتەرەکە، تا هەڵمی پەنجەرەکە بسڕم و بتوانم دەرەوە ببینم. دیسان دەرگایە، پەنجەرەکە لەبیر دەکەم و خۆم هەڵدەدەمە خوارەوە، ئەمجارە بەڕاستی قاچم ئازاری پێ دەگات، گوێی نادەمێ، ڕادەکەم و دەرگاکە دەکەمەوە.

وشک دەبم، ڕادەمێنم، چەند خولەکێک هیچ ناڵێم، بۆ یەکەم جار دوای دابڕان، ئێوە دەبینمەوە. ئێوە زۆر گۆڕاون، ڕەنگ و ڕووە جوانەکەتان بەئاسانی شێواویی پێوە دیارە. هانیکۆ گەورە بووە، تۆ توند باوەشم پێدا دەکەیت. دڵم پڕ دەبێ، دەگریم، هیچم بۆ ناوترێت، بەتوندی بە خۆمەوە دەتنووسێنم و بەرت نادەم. پێم دەڵێیت:

«دایکە، مەگری.»

داواکارییەکی سەختە، چۆن دەتوانم وا بکەم؟ بەرەو ڕووی باپیرت دەچم و دەمەوێت هانیکۆی لێ وەربگرم. هانیکۆ باوەش بە باپیرتدا دەکات و دەگری، نایەوێت بێت بۆ لام. ئەو من ناناسێتەوە، ئەو منی لەبیر کردووە. چۆن توانی وا زوو من لەبیر بکات؟ هیچم بۆ ناکرێت، لە

جێگەی خۆم دادەنیشم و دەگریم. ئەوانەی لە ژوورەوەن، دێن و هەریەک بە جۆرێک دەیانەوێت هانیکۆ فریو بدەن، بەڵام ئەو لەسەر بڕیاری خۆی سوورە. لەناکاو هەڵدەستم، بەزۆر هانیکۆ لە باپیرت وەردەگرم و بە شێوەیەکی سەیر تەماشای باپیرت دەکەم، وەک ئەوەی بمەوێت بەسەریدا بقیژێنم و بڵێم:

«بۆت نییە ببیت بە خاوەنی هانیکۆ.»

ئەها... ڕامین، هەمیشە کێشەم لەگەڵ زماندا هەبووە، هەرگیز نەمتوانیوە لە ڕێگەی زمانێکەوە گوزارشتی تەواو لە ناوەوەم بکەم. هەرگیز زمان ناتوانێت زمانحاڵی ناوەوەی هەندێک لە مرۆڤەکان بێت. هیچکام لە زمانەکان ئەوەندە بەرفراوان نین، کە ڕاستەوخۆ قسەی ڕۆح و ئاگری ناوەوە بە هەمان گەرمییەوە بگوێزنەوە، ئاگرەکانی ناوەوەمان هەتا دەگەنە زمان، دەبنِ بە دووکەڵ و گڕە بەتینەکەیان نامێنێت، منیش لەو جۆرە مرۆڤانەم، کە زۆر جار ناتوانم قسەی ناوەوەم بکەم، بۆیە بێدەنگی هەڵدەبژێرم، لێرەدا هەرگیز ناتوانم دەقاودەق گوزارشت لەو کاتە بکەم، کە چ هەستێکم هەبووە.

خوشکەکەت دەگری، دەیبەمە ژوورەوە، ئەو لە من دەترسێت، بە گریانەوە بە بچڕبچڕ پێی دەڵێم:

«من دایکی تۆم، کچە جوانەکەم.»

بەتوندی باوەشی پێدا دەکەم، دەگری، توند دەستی تۆ دەگرێت. ئەو فێری قسەکردن بووە، ئەو بە دەست زمانییەوە گیرۆدە بووە، وشەکان بەباشی لێک ناکاتەوە، بە دەنگە ناسکەکەی بانگی تۆ دەکات، داوات لێ دەکات بەجێی نەهێڵیت.

ئەو لە ڕۆیشتن ترساوە، ڕۆیشتنی من کاری لێ کردووە. ڕازیی دەکەم لەگەڵمدا بۆ بازاڕ بێت. جانتا هەڵدەگرم و بە دەموچاوی شێواوەوە

دەتانبەمـە دەرەوە، هانیکۆ نایەوێت بێتـە باوەشـم، بەقووڵی تەماشای تۆ دەکات، کـە پێـم دەڵێـت (دایکـە). تـا درەنگانـی ئێـوارە دەسووڕێینەوە. هەرچی یاریی جوان هەیە، بۆتـان دەکڕم، دەمەوێت دوکاندارەکانم خۆش بوێت. پەشـمەک بۆ هەرسـێکمان دەکڕم. هانیکۆ لێم نزیک دەبێتەوە، تۆ بـۆی ڕوون دەکەیتـەوە، کـە مـن دایکـی ئێـوەم و ئێـوە ڕۆژێـک لـە ڕۆژان لەنـاو منـدا ژیـاون.

بە چەند کاتژمێرێک تەواو لێم نزیک دەبێتەوە و پێم دەڵێت (دایکە).

لەسـەر باوەشـی مـن لەگـەڵ تۆدا دەیکات بـە شـەڕ. تۆ بێدەنگیت، تێبینیم کـردووە زۆر هۆگـری خوشـکەکەتی و ئـاگاداری هەیـت. باسـی خۆتم بۆ ناکەیت، پرسـیار ناکەیت و وەڵامـی پرسـیارەکانی منیش بە (بەڵێ) یان (نا) و بەکورتـی وەڵام دەدەیتـەوە، کەسـایەتییەکی شـەرمنت لـێ دەرچـووە، کە مـن زۆر نیگەرانـم بـەم گۆڕانـەت.

ڕامینـی دایە، مـن هەرگیز لـە دایکـم دوور نەبووم، نازانـم ئەگەر مرۆڤ لـە دایکـی دوور بێـت، چ هەسـتێکی دەبێـت، بـەڵام ڕاسـتیەکەی ئەوەیە، دایکم زۆۆر لـە مـن دوورە، ڕەنگـە چەندیـن خەیـاڵ لـە مـن دوور بێـت.

کاتژمێر نزیکی یەکـی نیوەشـەوە، مـن لـە نێوانتانـدا ڕاکشـاوم، دونیا هی منـە. خۆزگـە لـە کونێکـەوە خـۆت و خوشـکەکەت دەبینـی، چۆن فریشتەئاسا نوسـتوون. هانیکۆ لەسـەر دەم پاڵ کەوتـووە، دەسـتی کردۆتـە ملم. ئەڵبەت حـەزم نەدەکـرد بنـون، حـەزم دەکـرد تـا بەیانـی یاریمـان بکردایە، تۆ سەرت لەسـەر سـینگم دانـاوە، دەسـتت تونـد لـە ناوقـەدم گیـر کـردووە، وەک ئەوەی نەتەوێـت بـۆ هەمیشـە لێـم دوور بکەویتـەوە. بـەر لـەوەی بنوویـت، داوات لـێ کـردم چیرۆکـت بـۆ بگێڕمـەوە، بـەر لـە تەواوبوونـی چیرۆکەکـە، خەون چاوەکانـی داگیـر کردیـت. بـەڵام هانیکۆ درەنـگ نوسـت، پێچەوانـەی تۆ، زۆر قسـەی بـۆ کـردم، پاشـان داوای کـرد پشـتی بخورێنـم، بـەردەوام قسـەی

دەکرد، تا خاو بوەوە و لەناکاو بێدەنگ بوو. حەز دەکەم ژیان ئا لێرەدا بوەستێت، لەم وێنەیەدا، تا بۆ هەمیشە ڕۆحمان بە ڕۆحی یەکترەوە بێت، یاخود هەردووکتان بێنەوە ناو من و ببمەوە بە یەک کۆچەر، نەک وەک ئێستا سێ بەش و سێ پارچە بم.

# ٢٠

لەسـەر فەڕشـە تەڕەكـە پێیـە بچووكەكانـت دەكێشـیت بـە گوڵـی سووری فەڕشـەكەدا، بـە كاردانـەوەی پرژەی ئاوەكـە لەسـەر جەسـتە و دەموچاوت، ڕادەچڵەكیت. من قلْچەكە توند دەهێنم بە دەموچاوی پیاوی ناو فەڕشەكەدا:

«دایكە، پەپوولەی ناو فەڕشەكە كەی دەفڕێت؟»

«دایكـە، ئەگـەر چوارچێـوەی وێنـە هەڵواسـراوەكەی ژووری میوان بشـكێنین، پیـاوی نـاو وێنەكـە دێتـە دەرەوە؟»

«خەونـی ئاڵـۆز مەبینـە، كـوڕم. پەپوولـەكان تەنیـا لەنـاو فەڕشـەكەدا جوانـن، پیـاوی نـاو وێنەكـەش.»

ڕامینـی دایـە، تـۆ هیچـكات هەسـتت بـە بۆنـی بـا كـردووە؟ قـەت بووە بۆنـی بـا بتباتـەوە بۆ ڕابـردوو و ڕۆژگارێكت بیر بخاتـەوە؟ ڕەنگە دیسان پێكەنینت بەقسـە خەیاڵییەكانی دایكت بێت، بـەڵام هـەر بەڕاستی من هەست بەبۆنـی (بـا)كان دەكـەم، وایـە مـن هەسـت بـە بۆنـی بـا دەكـەم، ئەو بایانەی هەندێك جار تۆم لێ دەشـاردنەوە، تـا هەناسـەت تـەم نەیگرێت، یان بایەك، كە لـە بەردەمـی بەڕێوبـەری قوتابخانـەی ناوەندیدا پاییزێك تەنوورەكەی هەڵدامـەوە.

بۆنەکان، بایەکان بەقووڵی دەمگەڕێننەوە ڕابردوو. دەمەوێت وێنەی (با) بکێشم، یارمەتیم دەدەیت؟

بەتوندی قاچ دەکێشیت بە کۆشکە ئەرمەنییە خووساوەکەی ناو فەرشەکەدا و سەراپا جەستەم تەڕ دەکەیت.

# ٢١

لاویتیی دایکم لەبەر ئاوێنەکەدا وەستاوە، دەست بە پرچیدا دەهێنێ و دەگری، چەندە لە من دەچێت. لە ئاوێنەکەدا پڕ بە چنگم پرچم دەوەرێت. کاتێک تۆ منداڵ بوویت، نەنکت دەیوت لە وەرینی قژت مەترسە، ڕامین خەریکە دەتناسێت.

لە ئاوێنەکەدا چاوم ئاوساوە. لە ئاوێنەکەدا منداڵیم لەدەست داوە.

دەمەوێت یەک زللە لە ئاوێنەکە بدەم.

نەنکم دەڵێت:

« بەس لەبەر شووشەکاندا لە خۆت ورد بەرەوە، دەڵەیت لە خۆتدا بۆ کەسێکی دی دەگەڕێیت.»

نەنکم نازانێت بۆ کێ دەگەڕێم. لە ئاوێنەکاندا ڕابردووی دایکم و داهاتووی کچەکەم بوونی هەیە. پێدەچێت گەنجێتی خودی نەنکیشم، کێ دەزانێت؟ نەنکم نازانێت لە ئاوێنەکاندا بۆ داهاتوو دەگەڕێم. ژیان دەنگدانەوەیەکی گەورەیە، دەزانیت چۆن، گێلاسەکەم؟ دروست وەک ئەوەی کە لە ئەشکەوتێکدا هاوار بکەیت و گوێت لە دەنگدانەوەی دەنگی خۆت بێت بە چەندین زایەڵە. کۆی ژیان پرۆسەیەکی دووبارە

و لێکچووە. جۆرێکە لە دەنگدانەوە و دووبارەبوونەوە. ڕووداوەکان بە ڕەنگی جیاوازەوە، لە کاتی جیاوازدا، یان لە هەمان کاتدا ڕوو دەدەن. ڕەنگە ڕۆژێک تۆش وەکوو من نامە بۆ منداڵەکانت بنووسیت. ئەوەی دایکم ویستویەتی بیکات و نەیکردووە. ئەوەی نەنکم ویستوویەتی بۆ منداڵە بەجێماوەکانی بنووسێت و نەخوێندەوارییەکەی ڕێگەی پێ نەداوە، ئێستا من دەیکەم. دایکم دەنگدانەوەی نەنکمە، منیش دەنگدانەوەی دایکم، ڕەنگە تۆ و هانیکۆش دەنگدانەوەی من بن، کێ دەزانێت؟ هەموومان لەناو قاپێکی خڕی ئایسکرێمدا دەخولێینەوە. ڕەنگە ژنێکیش لە مۆزەمبیق ئێستا بیر لەوە بکاتەوە، بە بۆنەی یادی لەدایکبوونی کوڕە حەوت ساڵانەکەیەوە، نامەیەکی بۆ بنووسێت. لە سەدەی ڕابردوودا، نەنکم هاوسەرەکەی دەمرێ و منداڵەکانی بەجێ دەهێڵێت، دایکم هاوسەرەکەی دەمرێ و منداڵەکانی بەجێ دەهێڵێت. پێوەندیی من و هاوسەرەکەم دەمرێ و منداڵەکانم جێ دەهێڵم. ئێستا تێدەگەیت ژیان دەنگدانەوەیە؟

بە بڕوای تۆ، هەموو ئەمانە ئیشی ڕێکەوتە؟ یان قەدەر؟ تۆ بڕوات بە شتێک هەیە بە ناوی چارەنووسەوە؟ ئەگەر تۆ ئەم پرسیارە لە من بکەیت، لە وەڵامدا دەڵێم بەڵێ.

بوون و جووڵاندنەوەی ئێمە، بەپێی یاسایەکی نەگۆڕدراوی سروشت دەڕوات بە ڕێوە، هەموو مرۆڤایەتی بوکەڵەی بچووک بچووکن لەسەر تەختەیەکی شانۆیی، پەتی جووڵەکانمان بە دەستی یاریزانێکی شارەزا و لێهاتووەوەیە، خۆی دەمانجووڵێنێ و خۆشی چارەنووسمان دیاری دەکات و جڵەوی هەموو ڕووداوەکانی بوونی بە دەستەوەیە. چۆن بیەوێت ئاوا دەمانجووڵێنێ و ئاڕاستەی جووڵەکانمان دیاری دەکات. ئێمە بەبێ ئەوەی بمانەوێت، کارەکتەری سەر شانۆییەکەین. یانی هەر دەبوو من و باوکت ئێوارەیەک لە کافتریاکەی سلێمانی پالاس لەسەر مێزی ژمارە (٩) یەکتر ببینین و دوای دە ڕۆژ، لەژێر بەتانیەکدا کۆ ببینەوە و دوای نۆمانگ تۆ

لە ٢٥ی دیسێمبەردا، لە شەوێکی سپیدا، لە هەمان بەرواری لەدایکبوونی مەسیحدا، لەدایک بیت و نەفەری ژێر بەتانییەکە ببن بە سێ مرۆڤ، پاش پێنج ساڵ، ژێر بەتانییەکە قەرەباڵغ بێت و ببین بە چوار مرۆڤ. پاش شەش ساڵیش، هەریەکەمان لە قوژبنێکی ژیاندا بکەوین، کەواتە ژیان یارییەکی نەخشەبۆدارێژراوە، قەدەر شتێکە دەبێت باوەڕمان پێی هەبێت. یاخییەکان ئەوانەن ژێرانە مێشکیان دەخەنە کار و هەوڵی ئەوە دەدەن، ئاراستەی دەست و پێیان بەرەو لایەکی تری شانۆییەکە بەرن.

لە ئاوێنەکاندا زۆر لە دایکم دەچم. لە ئاوێنەکەدا دایکم هەردوو ئەژنۆی لە باوەشی ناوە و بەدیار پارچەیەک کاغەزەوە دەگری. منداڵیم لەژێر جێگەکەوە دەگری، نازانم بۆ گریانەکەی دایکم، یان بۆ ئەسیری باوکم؟

لە ئاوێنەکەدا قژ بە سەرمەوە نەما و هانیکۆی خوشکت هەر نەیناسیمەوە. لە ئاوێنەکەدا دایکم بەدیار نامەیەکی کۆنی باوکمەوە وشک هەڵدێت. دایکم لە پەنجەرەکەدا بەدیار چاوەڕوانیی هەواڵێکی باوکمەوە پاییزی هێنا.

تۆ و خوشکەکەت وەکوو من ئەوەندە لە ئاوێنە ڕامەمێنن، با وەکوو من ورد نەبن و نەبن بە هەزار پارچەوە.

دەمەوێت نامەکەی باوکم لە دایکم بدزم. ڕادیۆکە خشەخش دەکات. تابلۆ هەڵواسراوەکە دەڵێت، گریمان نامەکەت دزی، چۆزانیت بیخوێنیتەوە؟ دەمەوێت پێی بڵێم، ئەگەر خۆت بە باپیرم دەزانیت، لە چوارچێوەکە وەرە دەرەوە، بەس نایڵێم.

کەس نەبوو بە دایکم بڵێت:

خانم، تەنیاییت خۆش!

دایکم چەندە لە من دەچێت، لە پەنجەرەکەدا بەدیار چاوەڕوانیی

ئێوەوە پاییزم هێنا. خاڵت بە لارەلار فێری قسە بووە، داوام لێ دەکات ژمارەی پێڵاوەکانی بۆ بنووسم، تا بە مێروولەیەکدا بینێرێت بۆ بابە. دایکم کە گوێی لێ دەبێت، لەپڕ ئاوازێک بۆ گریانەکەی دروست دەکات. خاڵت چەندە بەدبەختە، ئەگەر بمزانیبا بنووسم، نامەکەم دەخوێندەوە، نا نا، لەپشتی نامەکە منداڵیی خۆم و گریانەکانی دایکم دەنووسیەوە.

بە کوڕەکەی دراوسێمان دەڵێم، فێری خوێندنەوەم بکات، دەڵێت تۆ جارێ منداڵیت. لێی دەپاڕێمەوە، دەڵێت بڕۆ سەیری نووسراوی پشتی پاسەکان بکە، فێر دەبیت.

چوارشەممان دایکم (شەو)ی دەدا بە سەریدا و دەستی ئێمەی دەگرت بۆ سەر مەرقەدی پیاوچاکان، خاڵت لەسەر عەباکەی دادەنیشت و مێروولە ڕەشەکانی دەگرتن و سەری لێ دەکردنەوە، ژنان ناوساجی و لوقمی شرووبییان دەبەخشییەوە. من لەژێر سێبەری دارتووەکەدا بە چیچکانەوە بیرم لە نووسراوی پشتی کۆستەرەکان دەکردەوە، یان ئەو هەورانەی دەکرا باوکم خۆی لە نێویاندا حەشار دابێت، پاش چەندین ساڵ، زانیم باوکیشت لەو کاتەدا لە هەورەکاندا بۆ باوکی گەڕاوە. دوور نییە باوکیشت لەو دەمەدا لەسەر مەرقەدەکە لەپشتی منەوە، بە چیچکانەوە دانیشتبێ و لە هەمان کاتدا بیری لەوە کردبێتەوە، کە باوکی لە هەورەکاندا خۆی شاردۆتەوە. خەڵکی بێبەڵگە دەڵێن، زەوی خڕە، بەڵام زەوی خڕە. ڕۆژێک لە وێستگەیەکی پاسدا وەستابووم، دوو ژن پێکەوە بەگەرمی قسەیان دەکرد، لەپڕ یەکێکیان بەوی تریانی وت، دیارە پاسەکە نایەت، من سەنتم پێ نییە، تۆ تەلەفۆنێک بۆ ئەژی بکە، با بێت بەشوێنماندا. دیار بوو ئەوی تر ژمارەی (ئەژی)ی پێ نەبوو، ژمارەکەی لە ژنی یەکەم وەرگرت. کاتێک ژنی یەکەم ژمارەکەی بۆ خوێندەوە تا ئەو بینووسێ، منیش لائیرادی گوێم لێ بوو تێبینیم کرد لەگەڵ ئەو ژمارەیەی شەو و ڕۆژی لە من تێک دابوو و بەردەوام تەلەفۆنی دەکرد و

لەپشتی تەلەفۆنەوە بێدەنگ دەبوو و خەیاڵەکانی دەبچڕاندم، هەمان ژمارە بوو. بۆ تاوێک حەپەسام و بیرم لە خڕێتیی زەوی کردەوە، هەروەها بیریشم لەوە کردەوە ئێستا ئەو ئەژی ناوە دێت و من بۆم دەر دەکەوێت چ ڕووخسارێکە و چ کارەکتەرێکی بێدەنگی سەر شانۆییەکەیە و لەکوێی قاپە ئایسکریمەکەدایە، لەم بیرکردنەوانەدا بووم، پاسەکە هات و منیش نەمویست لەپێناوی سەلماندنی زیاتری خڕێتیی زەویدا، هەلی هاتنی پاسەکە لەدەست بدەم، چونکە ڕەنگە ئەو ئەژی ناوە کەسێک بێت، من لە سووچێکی ژیاندا بینیبێتم و خڕێتیی زەوی بیخاتەوە بەردەمم. باوەڕم بەو قسەیەش هەبوو، کە دەڵێت ژیان هەلە.

بۆیە نەمتوانی هەلی سەرکەوتنی پاسەکە لەدەست بدەم.

دایکم لەسەر مەرقەدەکە بەرد دەهێنێت بە بەرددا، بەختی ڕەشی نانووسێت بە یەکدا. هەمیشە سەیری پارچەیەک لە کراسەکەی باوکم دەکرد، کە دایکم بە لقێکی دارتووەکەوە گرێی دابوو، دەمتوانی لەنێو سەدان پارچەپەڕۆی تردا بیناسمەوە.

دارتوو لە دوورەوە لەسەری ژنێک دەچوو، کە لەفی ڕەنگاوڕەنگ بە قژیەوە بێت. سەدان ژنی عەباڕەش و چاوەڕوان، تەنیاییی مەرقەدەکەیان تەنیبوو.

دایکم لە پەنجەرەکەدا شەوی لێ نابێت بە ڕۆژ، بۆن بە پاکەتی جگەرە بەجێماوەکەی باوکمەوە دەکات، کە من ئێستا دەزانم لیی نووسرابوو (ئەسپین). شەوی دوو سەد جار نامەکە دەخوێنێتەوە. لە نامەکەدا بۆ وشەگەلێک دەگەڕێت، کە باوکم نەینووسیون، یان بۆ سێبەری ئاسەواری وشکبووی فرمێسکی باوکم، یان بۆ شێوەی ئەسمەریی ئەو. نازانم، شتێکی ئاوا. لە ڕقی وێنەی ناو تابلۆکە، دەبێت فێر بم پشتی پاسەکان بخوێنمەوە، نامەکەی باوکیشم.

دەتبینم لە ئاوێنەکەدا تات لێ هاتوە و من شەوم لێ نابێت بە ڕۆژ. گوێم لە دایکمە لە پەنجەرەکەدا گۆرانی دەڵێت:

(نەخۆش کەوتم، نەهاتی گیانە، لیمۆ زەرد بوو، نەهاتی گیانە. سێو بۆگەنی کرد، نەهاتی گیانە. منداڵەکان فێری نامەنووسین بوون، نەهاتی گیانە. ڕەحمە خانی خاوەن ماڵ عەمری خوای کرد، نەهاتی گیانە، کاتی گیانکێشان وەرە.) من فێر بووم بە حونجە پشتی کۆستەرەکان بخوێنمەوە (بێ و ە ف ا) منداڵیم لەژێر سێبەری دارتووەکەدا جێ ماوە. لەودێرانەشدا جێ مام، کە نەمتوانی بیانخوێنمەوە، ئەگەر بۆت کرا، سەرێک لە منداڵیم بدە، لە خانووەکەی ڕەحمەخان.

لە داخی وێنە هەڵواسراوەکە، سەدان نامەم خوێندەوە، نامەکانی باوکت، کە بەتەنیشتی خۆمەوە بۆی دەنووسیم، نامەی کوڕە دراوسێکەمان... ئەهاااا! نامەکەی باوکیشم. لە ئاوێنەکەدا، بووم بە هەزار پارچەوە، هەرپارچەم لە زەمەنێک.

# ٢٢

گوێم لـە دەنگی خۆمـە، داوای باوکـم دەکـەم. دەمەوێت چاوم بکەمـەوە و ناتوانـم. سـەرمامە، هەست بە سڕبوونی پێیەکانـم دەکـەم. هەست دەکەم لە خەوێکی قووڵدام، هـەوڵ دەدەم خەبـەرم بێتـەوە و ناتوانـم. هـەر بەڕاستی حـەزم دەکرد هەمـوو ئەو ڕووداوانـە خەونێک بن.

بەئاسـتەم نیـوەی چـاوم دەکەمـەوە، پەرسـتارەکە لـەلای سـەرمەوە وەسـتاوە. دەورم دراوە بـە خزمـە تازەکانـی تـۆ. بـە پەرسـتارەکە دەڵێم:

«داوای شیرینی نەکەیت، چونکە کانولاکە دەستم ئازار دەدات.»

پێدەکەنێت و دەڵێت:

«مەگەر نەموت با کەس نەزانێت؟»

«کوڕێکت بووە، کۆپییەکە لە خۆت، زۆر لە تۆ دەچێت.»

بەئاستەم بزەیەک دەکەم و دەڵێم:

«ڕامین... ناوی دەنێم ڕامین.»

نـاوم نایـت ڕامیـن، لەسـەر خۆشەویسـتیی نووسـەری ئێرانـی (ڕامین جیهـان بگلـو).

تۆش سواری شەمەندەفەرەکە بوویت.

دەتوانم بیهێنمە بەرچاوی خۆم، ئەم سڕبوونەش جۆرێکی تری مردن بوو، سەفەرێکی تر بوو. پێشتر پێم وتبووی ڕۆح نەمرە. لەم سڕبوونەمدا سەفەرم بەنێو هەموو وێستگەکانی ڕابردووی ژیانمدا کرد و زۆربەی سووچ و کەلەبەرەکانم بینی، ساتگەلێکیشم بینی، کامێرای زیهنم لە یادەوەریمدا وێنەی نەگرتبوون. شوێنگەلێکم بینی، کە لەم شانۆییەی ژیاندا نەمبینیبوون. ڕۆح ڕەهایە، وەک پێشتر پێم وتیت، مردن وەک ڕۆشتنە لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی دی. هەر بۆخۆی ئەوەی تۆ ڕۆژانە هەشت کاتژمێر دەنوویت، بیرهێنانەوەی مردنە. هێزێکی دەرەکی دەیەوێت ڕات بهێنێت، لەگەڵ مردندا و پێت بڵێت وەک چۆن کاتێک دەنویت، جیهانێکی تر بوونی هەیە. بەم جۆرەش پاش مردن، دونیایەکی تر بوونی هەیە.

ڕامین، هەرگیز کات بەفیڕۆ مەدە بۆ خەو، کەمترین کات بنوو. وای دابنێ کاتێک دەنوویت، مردوویت، چ کارەساتێکە نیوەی ئەو تەمەنە کورتەمان بە مردوویی تێپەڕێنین. ئێمە ڕۆژانە ئەزموونی مردن دەکەین. هەر بۆخۆی ئەم سڕبوونەی من، جۆرێکە لە مردن.

سەرێک خوار دەکەمەوە، چاوم دەچێتە سەر پەنجەرەکە. دەبینم چینێکی سپی قەراغی پەنجەرەکەی داپۆشیوە، بەوەدا دەزانم ئاسمانیش نەجاتی بووە و بەفر لەدایک بووە.

لەو شەوەدا، تۆ یەکەمین هەنگاوت نا بۆ دوورکەوتنەوە لە من. یەکەمین هەنگاو بۆ سەربەخۆبوون و بۆ هەڵهاتن لە من، بۆ هەڵهاتن لە هێمنی. یەکەمین هەنگاو بۆ ناو تۆپە خڕەکە.

ئەوکات دڵنیا نەبووم تۆ هەنگاوی گەورەتر دەنێیت و زیاتر لە من دوور دەکەویتەوە. تۆ عەجولانە، زانایانە، دیکتاتۆرانە و میهرەبانانە دەستکاری ژیانت کردم.

ئەو شەوە من و ئاسمان بووین بە دایک، تۆ لەگەڵ بەفردا لەدایک بوویت. تۆ لە هەمان بەرواری لەدایکبوونی مەسیحدا لەدایک بوویت، مەسیحی چکۆلانەی من. من هێشتا لەگەڵ وشەی ژنبوون و مێردکردن ڕانەهاتبووم بووم بە هەڵگری شوناسێکی تر (دایک).

ئەو شەوە تۆیان پیشان نەدام، منیش پاش ئازارێکی زۆر، لەژێر کاریگەریی دەرزیدا توانیم بنوم. بەیانی لە دەنگی بانگی مزگەوتەکان و دەنگی کزی کەڵەشێرێک و خڕەخڕی عەرەبانەی پەرستارەکان بەئاگا هاتم. هەستم بە سەرمایەکی زۆر دەکرد. زۆر حەزم دەکرد هەستم، هەر هیچ نەبێت، لە پەنجەرەکەوە دیمەنی جوانی بەفر ببینم، بەڵام هەرچەندم کرد، نەمتوانی تەنانەت داشبنیشم. ئەو بەیانییە بەیانییەکی تەواو جودا بوو بۆ من. ڕۆژێکی تازە بوو لە ژیان. ڕۆژێک، کە تۆ خۆت لە جەستەم بێبەری کرد. سەرەتایەک بوو بۆ بەرپرسیارێتییەکی گەورە. ئیدی من دایک بووم، دەبوو خۆم بۆ تۆ تەرخان بکەم. شتگەلێک هەبوون، دەبوو بیانکەم و ناچار بووم واز لە هەندێک شتیش بهێنم. ئیدی لێرەوە ئاڕاستەی شتەکان ڕێڕەوێکی تریان وەردەگرت. تەماشا کە ڕامین، هەندێک جار تەنیا شەوێک لە توانایدا هەیە زۆر شت لە ژیانی مرۆڤەکان بەرێت و زۆر شت بگۆڕێ و زۆر شتیش ببەخشێت. سەیرم هاتێ چۆن وا لەپڕ، هەر لەپڕ بووم بە دایک.

لەناومدا هەستم بەبۆشاییەکی گەورە دەکرد، هەستکردن بەو بۆشاییە گەورەیە، زۆر قورسە. شوێنی تۆ خاڵی بوو لەنێومدا. بۆشاییی گەورەی بوون. مرۆڤ لەو کاتەدا هەست بە بۆشاییی خۆی دەکات لەناو خۆیدا.

کاتێک تۆیان بۆ هێنام و لەسەر سنگم دایان نایت، من هەستێکم هەبوو، بە هیچ شێوەیەک ناتوانم گوزارشتی لێ بکەم. وەها هەستێک، تەنیا دایکان دەتوانن هەستی پێ بکەن و چێژی لێ ببینن، هەستێکی زۆر سەیر و تازە و شاراوە.

ڕام، دەزانیت هیچ شتێک لە دونیادا لەوە خۆشتر نییە، کە هەست بکەیت تۆ دایکیت؟ ئاه دایکایەتی هەستێکی چەند خۆشە، بە ئازارەکانیشییەوە. هەندێک جار خوورپەی ئەوە بە دڵمدا دەهات، کە تۆ هاتوویتە دەرەوە، چونکە دڵنیا بووم لەوەی ئیدی کۆمەڵگە و دەوروبەر بە دڵی خۆیان پەروەردەت دەکەن و من هیچم پێ ناکرێت، تۆش دەبیت بە پیاوێک وەک هەموو پیاوە خۆرهەڵاتییەکانی دی. تۆیش دواجار کوڕی ئەم کۆمەڵگەیەیت، دایکت ناتوانێت بە دڵی خۆی پەروەردەت بکات، چونکە دەستەکانی تر زۆر گەورەتر و درێژترن لە دەستی دایکت.

دوو پەرستار دێن و یارمەتیم دەدەن، تا بتوانم دانیشم، داوام لێ دەکەن شیرت پێ بدەم. ئەو قسەیە زۆر لەناکاو و سەیرو تازەیە بەلامەوە، چەند چرکەیەک من بەسەرسامی سەیری پەرستارەکان دەکەم دواتر دەڵێم:

«نازانم.»

یەکێک لەوان مەمکی ڕاستم دەر دەهێنێ، دەیسڕێت و دەیخاتە دەمە بچکۆلەکەتەوە، تۆیش وەکوو بێچووە کەروێشکێکی برسی، دەمت دەگێڕیت، ئەوە بۆ من کەمێک ناخۆشە و پێی ڕانەهاتووم، ناتوانم بەردەوام بم. پەرستارەکە دووبارە زۆرم لێ دەکات. ماوەی دوو ڕۆژ خانمی پەرستار دێت و فێری شیردانم دەکات بە تۆ.

ئەوەندە جوان و سەیر و ناوازەیت بەلامەوە، بەردەوام بەوردی تەماشات دەکەم. دەستە بچکۆلەکانت دەخەیتە دەمتەوە. کاتێک دەگریت، دەنگێکی سەیرت هەیە، وەکوو دەنگی پشیلەیەک. شەوان بەر لەوەی تۆ بگریت، بە خولەکێک من خەبەرم دەبێتەوە، وەک ئەوەی کەسێک پێم بڵێت تۆ برسیتە. گوپە خڕەکانت پەمەیین، وەکوو دیوی ناوەوەی توێکڵەشووتییەک. ناهێڵم کەس ماچت بکات. بڕیارێک دەر دەکەم، کە

جگەرەکێشان لە ژوورەوە قەدەغەیە. ئەنکت مووروویەکی شینت پێوە دەکات، منیش هەتا دەستم دەیگرێت، فڕێی دەدەم. فێر دەبم کە شیرت خوارد، بتدەم بە شانمدا و دەست بە پشتدا بهێنم، تا قرقێنە دەدەیتەوە، بستێک پێی بالا بکەم و پێتبلێم «نۆششش،» دایکایەتی چەندە خۆشە.

ڕامین، تۆ نۆ مانگ باشترین هاوڕێی ڕۆحیی من بوویت، بەلام گلەیی بێت، تۆ زۆر زوو لە من هەڵهاتی، لانی کەم، دەبوو لەبری نۆ مانگ، نۆ سەدە لەوێدا، لەناو مندا بمێنیتەوە.

# ٢٣

ژیانم دێشێ، دونیام نائارام. بە پشتدا خۆم بەسەر قەنەفەکەدا شۆڕ کردۆتەوە، قژم لە ئەرزە نیمچەتەڕەکە دەخشێت، کە سێلیم خەریکی سڕینەوەیەتی.

سەربەرەوخوار سێلیم دەبینم. بیر دەکەمەوە، سێلیم بە هەڵاوگێڕاوی جوانترە، ڕەنگە تەواوی ژیان سەربەرەوخوار و هەڵاوگێڕاو جوان دەر بکەوێت، کراسە پەمەییەکەشم.

لیمۆیەکم کون کردووە و بەتاسەوە ئاوەکەی دەخۆم.

ئێستا وەکوو منداڵێکم لێ هاتووە، ئەگەر لێم گەڕێن لە برسان دەمرم و هێواش هێواش ژەنگ دەمخوات؛ ژەنگی ژیان.

سەرلەئێوارەیەکی ناخۆشە. ئێستا ئەگەر لێم بپرسن باشترین شت لە ژیاندا بیکەیت چییە؟ دەڵێم، «هەڵگەڕاندنەوەی دونیا.»

دەنگی بەرزی نەنە لەسەر بەرماڵەکە لەگەڵ گۆرانییەکانی (لیۆنێل ڕیچ) تیکەڵ بە یەک دەبن. نەنە پێی وایە هەتا زیاتر دەنگ هەڵبڕێ، خودا زیاتر گوێی لە دەنگیەتی.

بەزەییم بە خوشکەکەمدا دێتەوە، کە هەتا ماوە خەون بە گەشتکردن

به چین و [illegible]

«سەربەرەوخوار سەیری ژوورەکەت بکە، دەبێت بە چین و ئەمازۆن.»

بیر دەکەمەوە، ئێوە نەبن، چەند دووبارەیە هەناسەدان، چەند دووبارەیە چاوترووکاندن یان سەرکەوتن بە پلیکانەکاندا بۆ سەربان. ئێوە نەبن، چەند گەوجانەیە یاریکردن بە ناوکی گوێژ لە دەمدا، یان گوێگرتن لە گۆرانییەکی عەلی مەردان.

«هەست دەکەم گوێت لە دەنگمدا دەزرینگێتەوە،» ئەم ڕستەیە هەڵگێرەوە.

بەڕاست، تۆ هەرگیز دونیات سەربەرەوخوار و هەڵاوگێڕاو بینیوە؟ تاقی بکەرەوە.

دەمەوێت دیسان پێت بڵێم، ئەم دونیایەی تۆ دەیبینی، بریتییە لە درۆیەکی گەورە، نەکەی باوەڕ بە درۆ زەقەکانی ژیان بکەیت. ئەگەر قاچت هەڵکەوت و کەوتیت، ئەگەر بەردەکانی ژیانت بەر کەوت، دڵگران و نائومێد مەبە، مرۆڤ دەبێت بەرگەی هەموو ئەو بەردانە بگرێت، کە لە بەردەمیدان، دەبێت نەکەویت، دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بیت، بەردت تێ بگیرێت، بەردی گەورە. ڕەنگە بەردهاوێژەکان کەسانی زۆر نزیک بن، کەسانێک، کە چاوەڕوانی ئەوەمان لێیان نەبووە، ڕەنگە کەسانێک بن، کە بە دڵەوە نووساون، ڕەنگە خودی بەردەکە بن. لە ڕاستەوە، لە چەپەوە، لە پێشەوە، لە دواوە، بەردەکان زۆرن، بەردەکانی ژیان، بەردهاوێژەکانی ژیان. وەک وتم، هەندێک جار دۆستەکانمان خودی بەردەکەن و بەڕەقی بەر وجود و دڵ و ڕۆحمان دەکەون. لات ئاسایی بێت جووجەڵە، چونکە ئێمە مەحکومین بە مرۆڤبوون. مەحکومین بە ژیان، ئەم دونیایە جاویدانی نییە، پایەدار نییە. ژیان خۆی عقوبەیە، ئێمە لە عقوبەداین. ئەها، سەیر کە، ئەو کاتەی ئادەم و حەوا هەڵەیان کرد و حەوا سێوەکەی خوارد،

خودا سزای دان، سزاکەیان ئەوە بوو، ماوەیەک لە زەویدا بمێننەوە.
بۆیە حەز دەکەم ئەو باوەڕەت لا دروست بێت، کە ژیان خۆی سزایە
و چاوەڕوانی باشەی زۆر و خۆشیی زۆری لێ مەکە. دەبێت هەمیشە
ئامادەباش بیت بۆ سزا.

وەک وتم، دەشێ هەموومان دوای جێهێشتنی ئێرە، لە جۆر و شێوەی
تردا بێینەوە ئێرە، یاخود لە دونیایەکی تردا بوونمان هەبێت. وەکوو
ڕووەکی پاقلە وشک دەبین و پاشان لە بەرگی پاقلەیەکی تردا، یان لە
بەرگی دارتوویەکدا، یان لە بەرگی مشکێکدا دووبارە دروست دەبینەوە.
لەمەوە بەو ڕاستییە بگە، کە ڕۆح نەمرە. بیر مەکەرەوە ڕۆح ئەوەندە
بچووکە لەم سەر زەمینەدا جێی ببێتەوە. ڕۆح نەک لە جەستەی تۆدا،
بەڵکوو لەسەر زەویش جێگەی نابێتەوە. ژیان درێژەی هەیە، پێشتریش
پێم وتیت بیر لەوە مەکەرەوە، تۆ تەنیا جەستەیەکیت و دڵت بە جەستەت
خۆش نەبێت. جەستە شتێکی کاتییە، دڵنیا بە ڕۆژێک وەکوو بەرگێکی
تەسک توڕی دەدەیت و لەجێگەیەکدا جێی دەهێڵیت. بیر لەڕۆحت بکەرەوە
ڕۆحێکی نەمر کە ڕەنگە لە چەندین جەستەدا خۆی ببینێتەوە. کاتێک
مرۆڤ دەمرێت، دەتوانێت زۆربەی پارچەکانی جەستەی ببەخشێت بە
کەسێکی دی، بەڵام ناتوانێت ڕۆحی ببەخشێت، لەمەوە تێبگە، کە مرۆڤ
خاوەنی جەستەی نییە، جەستە شتێکی کاتییە، بەڵام ڕۆح نەمرە. بیر لە
ژیانی ئاسمانی بکەرەوە. ڕۆحت مەکە بە کۆیلەی جەستەت. گرنگە بەر
لەوەی ڕۆحت بۆ هەمیشە ئازاد بێ و خۆی لە جەستەت قوتار بکات،
پێش ئەو وادەیە تۆ ڕۆحت ئازاد بکە، ڕەهای بکە، چی دەخوازێ دوای
داخوازییەکانی بکەوە. گوێ لە دەنگی ناوەوەت بگرە و هیچی ترت بە
خەیاڵدا نەیەت. دڵت بە شتە دونیاییەکان خۆش نەبێت، ئازیزی من.
کاتێک ڕۆحت ئازاد کرد، ئەوکات بۆت دەر دەکەوێت ژیانی دونیایی و
پابەندبوونەکانی چەند بچکۆلە و بێمانان. دەزانیت چۆن؟

وای دابنێ ژیان ژوورێکی خنکێنەرە، ژوورێک، بەردەوام جگەرەی تێدا دەکێشرێت. تۆ هەست بە پیسبوونی هەوای ژوورەکە ناکەیت، تا کارەساتێکە ڕۆژێک ئەو وێنەیەی چەندین ساڵە هەڵت واسیوە، لێی بکەیتەوە و ئەو جیاوازییە ببینی، کە لەنێوان ڕەنگی ژێر تابلۆکە و ڕەنگی تەواوی ژوورەکەدا هەیە. بۆیە هەرکات بڕیارت دا ڕۆحت ئازاد بکەیت و گوێ بەم ژیانە تەنگە نەدەیت، ئەوە ئەو کاتەیە کە تۆ وێنەکەت لێکردۆتەوە و جیاوازیی نێوان ڕەنگی ژوورەکە و ڕەنگی ژێر تابلۆکەت بینیوە و تێگەیشتووی ژیان چۆن تەنراوە بە هەوایەکی پیس.

ڕامین، دەمەوێت لێت بپرسم، ئایا هەموو ئەوانەی دەژین و لەپرۆسەی ژیاندان خاوەنی ڕۆحن و ڕۆحیان هەیە؟ بۆ نموونە ڕووەک، دەتوانیت بیهێنیتە بەرچاوی خۆت، کە گوڵەیاسەمینێک ڕۆحی هەیە؟ ئایا کاتێک ڕووەکێک هەڵدەکێشیت، مانای وایە ڕۆحێکت کێشاوە؟ یان تۆ بکوژیت؟ ئایا ڕۆحکێشەکە تۆیت؟ یان تۆ هۆکارێکیت بۆ ڕۆحکێشانی و کەسێکی تر، هێزێکی تر ڕۆحەکە دەکێشێت؟

سێلیم بەسووکی زللەیەک بە ڕوومەتە سەرەوخوارەکەمدا دەکێشێ و من بەتوندی ڕادەچڵەکم. بیر دەکەمەوە، ئەم ژیانە پێویستی بە ڕاچڵەکینی گەورە هەیە. پێویستە بەردەوام دەستێک هەبێ و بتهێنێتەوە سەر خۆ. دەستێک بەتوندی ڕات چڵەکێنێ. مرۆڤ زووزوو پێویستی بە ڕاچڵەکین هەیە، ڕاچڵەکینی گەورە.

سێلیم داوام لێ دەکات بەجوانی دانیشم، تا بتوانێت بەباشی قسەم لەگەڵدا بکات. سێلیم بەردەوام کێشەی لەگەڵ ئەوەدا هەیە، کە هەمیشە چەرچەف و پێخەفەکانم پەڵەی مەرەکەبیان پێوەیە. زۆر خۆم دەپارێزم، پێنووسەکان نزیک لە جێگەی نوستنەکەم هەڵنەگرم، بەڵام هەمیشە پەڵەی نیلی تۆخ بەسەر چەرچەف و بیجامەکانمەوە دەبینرێت، یان کونی بچووک لەسەر ئەژنۆکانم دروست دەبێ و پاش هەفتەیەک، بەدەم خوێندنەوەوە،

یان بەدەم لیمۆخواردنەوە، دەیکەم بە شەبەقێکی گەورە. سێلیم دەڵێت:
«وریای درز و کونی بچکۆلە بە لە ژیانتدا، وەکوو کلۆری ددان یان کونی بیجامەکان زوو گەورە دەبن و ئەوکات هەرگیز ناتوانیت پینەیان بکەیت. وریای شەبەقەکانی ژیانت بە.»

# ٢٤

لـە سـەری بڕدراوی مانـگاکان دەترسـیت، برژانگەکانـت جـووت دەبن. نەنکت دوو ڕۆژ پیازت لـێ دەدا و ئێـواران سـێ جـار بەسـەر ئاوێکی ڕژاودا دەتهێنێ و دەتبات، گوایا ترست لـێ دەر دەکات. مـن بەدیار لقی شکاوی بییەکانـەوە، کە بەسـەر جۆگەلەئاوەکـەدا شۆڕ بوونەتـەوە، خەیاڵ دەمباتـەوە. لـە خەیاڵمـدا باخێکی گـەورەی وەک باخەکـەی ماڵـی باپیرتمان هەیە و پەرژینی دار بۆ ئەسپەکان و باخـەکان دروست دەکەین. نیشانە لە بوتڵەبیرەکان دەگرینـەوە، بە ئەسـپ سـەفەر دەکەیـن. بیر لـە دروستکردنی خانوویەکی تەختـە لـە نزیکـی دەریـا و دروسـتکردنی حەوزێکی پڕ لـە ڕۆبیـان دەکەمـەوە. دەنگی تـۆ خەیاڵەکانـم هەلاهـەلا دەکات، بانگم دەکەیت:

«دایکە، وەرە دەمەوێت پلەیستەیشن بکەین.»

پلەیستەیشـن دەکەیـن. سـەربازەکان دەکوژیـن. دەبیـن بـە تـەڕەزان و خۆمـان بە تەونـی دارەکانـەوە هەڵدەواسین. گەشت دەکەیـن لـە دارێکەوە بـۆ دارێکی دی، لـە ناوچەیەکـەوە بـۆ ناوچەیەکی دی، لـە دونیایەکـەوە بۆ ئـەوی دی، لـە زەمەنێکـەوە بـۆ زەمەنێکـی دی.

یاریـی دووگۆڵـی دەکەیـن، خـۆم خـاو دەکەمـەوە و تـۆ بـە دڵـی خۆت گۆڵـم لـێ دەکەیـت. باوکـت خـەون دەبینێـت ببیـت بـە یاریزانێکی بـاش،

دەستێک جلی یانەی ڕیاڵ مەدریدت بۆ دەکڕێت. هەمیشە لەگەڵ خۆی دەتبات بۆ یاری. ناوی زۆربەی یاریزانەکان دەزانیت. هەمیشە قژت بە مۆدێلی قژی کریستیانۆ دادەنێت. ئەمە حەزی باوکتە، بەڵام هی من نییە، تۆ بە حەزی هیچکاممان مەکە و دوای حەزەکانی خۆت بکەوە.

ئەگەر بتەوێت لە شتێکدا بە دڵی من یاخود باوکت بکەیت و حەزی خۆتی تێدا نەبێت، دڵنیا بە سەرکەوتوو نابیت، چونکە ئەو کاتە وەکوو ئەرکێک تەماشای دەکەیت، نەک وەکوو حەزێک. ئەگەر مرۆڤ باوەڕی بە شتێک نەبێ و پاڵنەرێکی دەرەکی وای لێ بکات کارێک بکات و حەزی خۆی تێدا نەبێت، ئەوا زۆر ئاسان ئەو کارە هەڵدەوەشێتەوە. بۆ نموونە ژنێک، کە لە ناوەوەیدا بڕیاری لەوە نەدابێ سەرپۆشێک بدات بە سەریدا و هۆکارێکی ناوەکی نەبووبێتە هۆی ئەوەی ئەو پارچەقوماشەی بە سەرەوە بێت، بە بڕیار و پاڵنەری دەرەکی و ئەوانی دی ئەمەی کردبێت، ئەوا زۆر نزیکە ڕۆژێک لەچکەکەی لە سەری بکاتەوە و بیبەستێت بە کەمەریەوە و سەمای پێوە بکات. ئەگەر ئاسنگەر نەبیت، هەرچەند ئاسنی گەرمیش بکوتیت، ناتوانیت ئاسنێکی خواریش ڕێک بکەیتەوە.

وریا بە، زۆر وریا، ژیان یاریی دووگۆڵی نییە لەگەڵ من. ئەو وەک من خۆی گێل ناکات تا گۆڵی لێ بکەیت، نابێت چاوەڕوانی کەسیش بکەیت، تا پاست بداتێ، ئەوکات تۆ گۆڵ بکەیت، ئەگەر وریا نەبیت، ژیان بە دڵی خۆی گۆڵت لێ دەکات. ئەوەش بزانە، ئەگەر زۆر بەوریایی مامەڵە نەکەیت، کارتێکی سوورت دەداتێ و لە گەمەکەی خۆی دەتکاتە دەرەوە.

# ٢٥

ئەنکم خەریکە خۆکوشتنی کچەکەی ئەمنە خانم بۆ ڕاڤە دەکات، منیش بۆ ئەوەی نەنە هەست نەکات قووتووی پیپسییەکەم پڕ کردووە لە شەراب.

ترسێکی گەورەی لێ نیشتوە، چونکە خۆکوشتنی کچان، گەیشتۆتە دراوسێی دەستەڕاست.

«خودا بە گەورەییی خۆی ڕەحممان پێ بکات، هەموو ساڵێک لەم گەڕەکە شووم و نەفرەتییەدا، کچێک لە ئاکامی ئەڤینێکی سەرنەکەوتوو و بەدەستنەهاتووەوە خۆی دەکوژێت، شەیتان لەبن گوێیان دەخوێنێت. گوێ لە بەسەرهاتی ئەوینی تەمومژاوی دەگرن. سەیری فیلمی عاشقانە دەکەن. عەشق دایکی هەموومانی گاوە.»

نەنە پێی وایە ژن ئەگەر لەناو خەم و ناسۆریشدا بڕزێت، نابێ خۆی بکوژێت. ژن دەبێت مردنێکی شکۆمەندانە بمرێت، نەک لەبەر هەتیوەلووسکەیەک خۆی بە پانکەدا هەڵبواسێت.

من تا هەنووکە نەمبیستووە لەم گەڕەکەی ئێمەدا کچێک وەک مەدالیا خۆی بە پانکەدا هەڵبواسێت.

خۆکوشتی کچەکانی ئەم گەڕەکە لێکچوو بوو، هەموویان وەکوو

نەخۆشییەکی بۆماوەیی بۆیان مابووەوە. هەموویان دەبەیەکی پێنجلیتری نەوتیان دەکرد بە خۆیاندا و قرچەچ چەرخەکەیان هەڵدەکرد و بە قیژەقیژ بە کۆڵانەکەدا ڕایان دەکرد. دراوسێکان بەپەلە دەیانخستە بەتانییەکەوە و دەیانکرد بە نەخۆشخانەکەی گەڕەکدا و لەوێوە لیو لیو لیو، بە ئۆتۆمۆبیلێکی فریاکەوتن ڕەوانەی نەخۆشخانەی گەورەی شاریان دەکرد و لەوسەرەوە بەبێ ڕۆح لە هەمان بەتانیدا دەیانهێنایەوە.

هەموو کچەکانی ئەم گەڕەکە ئاگر بردنی. عەشقی نێوان ئاگر و کچەکانی ئەم گەڕەکە، نهێنییەک بوو کەس درکی پێ نەکرد. ئەوان لەگەڵ ئاگردا جووتبوون. جووتبوون لەگەڵ ئاگر... ئای لەو عەشقە مەزنە، کێ نالێ ڕۆژێک دایکیشت هیچ پیاوێک لە ئاگر بە دڵسۆزتر نازانێت، کێ دەزانێ، بەڵام زۆر گێلانەیە پانکەیەک لە پیاوێک بە دڵسۆزتر بزانیت. تەنیا کچەکەی ئەمنە خان بوو، کە دۆستایەتیی لەگەڵ ئاگردا دروست نەکرد و نەیدەویست ئەو شەرەفە بە ئاگر ببەخشێ و بە ئاگر کۆتایی بەژیانی خۆی بهێنێت. نەیدەویست پێستی تەواوەی خۆی وەک ئەوانی تر بە شۆستەکەوە جێ بهێڵێ و مۆری خۆی بە کۆڵانەکەوە بنێت. ئەو نەیدەویست دوای خۆی ئاسەوارێک جێ بهێڵێت. مانگی پێشوو لە هەوڵێکی تریدا بۆ خۆکوشتن، لە عەسرێکی قەرەباڵغدا، لەو کاتەدا کە ژن و کچەکانی تر لەسەر عەرەبانەی قوماشفرۆشەکە سەودای ڕەنگی سوور و قوماشی هندییان دەکرد، دەرمانی مشکی خوارد. لیو لیو لیو بردیان و پاش چەند کاتژمێرێک، لە پەنجەرەکەوە بینیم بە سپوساغی هێنایانەوە.

کچەکانی ئەم گەڕەکە ئاگریان کردبوو بە مارشی خۆشەویستییان، هەموو نامورادانە سەریان نایەوە. شەیدای ئەو کوڕانە دەبوون، کە لەسەر دیواری ماڵەکان شەوان بەدزییەوە دروشمی خۆشەویستییان دەنووسی. کچەکان بەکۆمەڵ سەریان بە یەکەوە دەنا و نهێنییەکانیان باس دەکرد. کچەکان بەکۆمەڵ عاشق بوون. هەرکەس دڵی بە مەعشوقی

خۆی خۆش بوو، هەریەکەیان نهێنییەک و چیرۆکێکی هەبوو. گەز گەز بالآیان بە نووسینی سەر دیوارەکان دەکرد. لەسەر دارتووەکەی ناوەڕاستی کۆلانەکە، یەکەم پیتی ناوی هەموو ئەویندارەکان هەلکۆلرابوو. لە پەنجەرەکەوە دوعام دەکرد ئەو ڕۆژە نەیەت، کە یەکەم پیتی ناوی من لەسەر دارتووەکە هەلبکۆلرێت. دلنیا بووم لەوەی هەرکەس ناوی لەوێدا هەلبکۆلرێت، لە کۆتاییدا ئاگر دەیبات. من ترسم لەو لیستە هەبوو، کە لەدارەکەدا هەلکۆلرابوو، لیستی ناوی ئەوانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبن بە فیدای عەشق. لیستی ناوی ئەوانەی پێستیان بە شۆستەکەوە جێ دەما. دەبوو گەڕەکەکەی ئێمە ناوی (ئەڤینستان)بێت. شکورم بەوەی ئەوینی ئێوە لە عەشقی پیاوەکان دووری خستوومەتەوە. ئێوە توند خۆتان بە دلمەوە نووساندووە. مالەکەی ئێمە کەوتبووە کۆتاییی کۆلانەکەوە، د ەتوانیت بلێیت نزیکە لەکۆتاییی دونیاوە. لەم گەڕەکەدا، بێشومار نەوەکان وەک کەروێشک زیاد دەکەن و زەمەن بەلای دلڕەقییەکاندا تێدەپەڕێت.

لەم گەڕەکەدا، هاوکات لەگەل عەشقدا دلڕەقی بێشومار بوونی هەیە. باوکان و برا و مێردەکان بەهێز و دلگەرم و دلڕەقن و دەتوانن سەرپشک بن لە ژماردنی ئەڤینەکانیاندا.

دلڕەقیی پیاوەکان بالی بەسەر ئەم کۆلانەدا کێشاوە، لەسەر ڕەفەکانی بیرکردنەوەمان، لەناو حەوشە و مالەکانماندا، لە چەقی پێخەفەکانماندا، لەکتێبخانەکانماندا، دلڕەقی ڕیز کراوە. وەک توحفەیەک هەلگیراوە.

لەم گەڕەکەدا، چەندین نەوە هاتن و ڕۆیشتن. دیوار و دەرگای مالەکان چەندین جار ڕەنگکرانەوە. پێستی ناسکی دەیان کچ بە چیمەنتۆکانەوە جێ ما. پرچی درێژیان لەناو پشتییەکاندا ڕزی، کەچی دلڕەقی هەر نەمرد و مایەوە و ڕەگی داکوتا.

نەنکم ترس بەتوندی دەیلەرزێنێت، ترسی ئەوەی بەم نزیکانە ئاگرەکە

لە ماڵی ئێمەدا و لە ژوورەکەی مندا بکرێتەوە. ئەو ناڕاستەوخۆ دەیەوێت هۆشیاریم پێ بدا و ترسی ئاگر لە دڵمدا بچێنێت.

زووزوو قووتووی پیپسیەکە دەنێم بە سەرمەوە. ئەو نازانێت من هێندەی سووتانی هەموو کچەکانی گەڕەک، سووتانم چەشتوە. هەتا بتوانم، سەمای خۆم دەکەم لەم ئاگرەدا.

خۆنەکوشتنی من لەبەر ئەوە نەبوو ئومێدێکم بە ژیان هەیە، نا، بەڵکوو پێوەندیی بە نائومێدبوونمەوە هەیە لە مردن. زۆریش باوەڕم بەوە هەیە، پێ بە دڕکەکاندا بنێیت و پانیان بکەیتەوە و ڕێگەکەی بەردەمت پاک بکەیتەوە، شەڕی ژیان بکەیت. چێژ لەو شەڕە دەبینم، کە لەپێناوی ژیاندا دەیکەم، ئەمە ترسێک نییە لە مەرگ، نا، بەڵکوو هەموو شتەکان و تەنانەت مەرگیش، لە کات و جێگەی خۆیاندا جوانن.

نەنکم دەڵێت:

«لە کۆتاییدا پێپسی سەری تۆ دەخوات.»

«ئاییی! نەنە، نازانی پیپسی چەند پێویستە بۆ ژنێکی کونکون، ئەگەر پیپسی نەبێت، بەم هەموو برین و کونەوە چۆن بە گەڕەکدا دێم و دەچم؟ ئەگەر کچەکانی گەڕەک هەموویان عادەتیان بە پیپسیەوە بگرتبایە، ئێستا لە کۆڵانەکەدا ژیان جۆرێکی تر دەبوو، مردنیش. نەنکە، هەست دەکەم تۆش زۆر پێویستت بە پیپسی هەیە.»

«بەسی کە ئیتر.»

نەنکم بەدەم ڕاڤەکردنی حەدیسەوە، خەون دەیباتەوە. بە قووتووە شەرابەکەوە دێمە سەرەوە. حەز دەکەم هێندە مەست بم، یەک سەدە نەیەمەوە هۆش خۆم. دەنگی پرسە و قورئانخوێندن لە ماڵی ئەمنە خانەوە دەگاتە ژوورەکەی من و نزیکیی مردنم پێ ڕادەگەیەنێت.

ڕامین، لە سووچێکی ئەم ژیانەوە دایکت ببینە، چۆن بێ ئێوە

لە ڕابردوودا جێ ماوە، لە وێنەکاندا جێ ماوە. ببینە چۆن بەدزیی چاوی دونیاوە، جگەرە دادەگیرسێنێ و بەدەستی چەپی سووتووەکەی دەوەرێنێت.

لە بێ ئێوەییدا تل دەدەم. شەوان هەوڵ دەدەم کتێبەکان و وشەکانیان بخەمە شوێنی خاڵیی ئێوە، تا بەیانی لەگەڵیاندا تووشی دەیان دڵەڕاوکێ و ترس و هەیەجان دەبم. تا بەیانی سەفەر بەنێو زەمەنەکاندا دەکەم. لەمسەری زەوییەوە دەمبەن بۆ ئەوپەڕی دونیا. لای فیرعەونەوە دەمبەن بۆ چەندین سەدە بەر لە ئێستا و خۆم دەبینم شیوەن بۆ ژەهراویکردنی سوقرات دەکەم.

لەگەڵ گاپۆدا دەکەومە خۆشەویستییەوە و دەمەوێت لە هەموو ژنەسۆزانییەکانی تری شیکتر بم. دیوانەکەی مەحوی دەهێنم، ماچی دەکەم و دەینێم بە نێوچەوانمەوە. دوو سەد جار ئەم هەناسەیەی (مەحوی) دەخوێنمەوەو لێی تێر نابم:

تا لەماڵی دەر نەکردووی ئەم ژنی صەد شووکەرە

مەحوی، ئازایانە بدە تۆ سێبەسێ دونیا تەڵاق

کتێبەکان دەمهێنن و دەمبەن. دواجار بەنەفرەتیان دەکەم و دڵنیا دەبمەوە لەوەی هێز نییە بۆشاییی گەورەی ئێوە پڕ بکاتەوە.

ڕۆژەکان کورت بوون و گۆی زەوی خێرا دەسووڕێتەوە. مردن دیوارێک دووره لێم. دەڵێیت ئاوێنەکە تووشی کەمخوێنی بووە.

هەست دەکەم زەوی خەریکە قووتم دەدات، نیوەم لەنێو دەمی زەویدایە.

هەرچەند دەکەم لەگەڵ ئەم دوورییەی ئێوە ڕانایەم.

هەست دەکەم نەخۆشم، تایەکی قورس دای گرتووم، شوێنێکم دەیەشێت، نازانم کوێمە. تەنیا دەزانم سەرم قورس بووە و دڵم دە کیلۆ ئاسنی پێدا هەڵواسراوە. گەرمییەک لەپشتی ملمەوە دێت، لەسەر سنگم کۆ دەبێتەوە. دەنگی قورئان لە ماڵی ئەمنە خانەوە بەرزتر دەبیسترێت. پوورت پێوەندی دەکات، زەنگی مۆبایلەکە ڕام دەچڵەکێنێت، وەک ئەوە وایە بە خێراییەکی لەڕادەبەدەر خرڕڕڕڕ بمدەن لە ڕندە.

خوشکەکەم لەوپەڕی دونیا لە خەونیدا من دووگیانم. دەشێ تۆ لێرە نیگەران بی و کەسێک لەوپەڕی ژیان هەستت پێ بکات.

دەمەوێت جگەرە بکێشم، ئەوەندە بکێشم، جگەرم وەکوو قژە خەناوییەکەی نەنە ڕەش بچێتەوە، یان وەکوو سمێڵی بۆیەکراوی باپیرت.

دەچمە بەر ئاوێنەکە، ناتوانم خۆم جوان بکەم، قژم درێژە و دەمەوێت بیبڕم. ژوورەکەم بەو هەموو بۆنە خۆشەوە، دەڵێیت تەرمی تێدا هەڵگیراوە.

دەنگی هۆڕنی ئۆتۆمبێلی خۆڵەکە هەراسانم دەکات. دەمەوێت دڵم بخەمە ناو عەلاگەیەکی ڕەش و بە کاکی خۆڵڕێژ بڵێم، هەتا دەستت دەیگرێت فڕێی بدە. دەتوانیت بیخەیتە بەردەمی پشیلەیەک، یان لە زبڵدانەکانی دەرەوەی شار داینێیت، مانگایەک بە عەلاگەکەوە بیخوات یان سەگێک گووی پێدا بکات.

یان حەز دەکەم تێکەڵی نانەوردەکانی بکەم و نەنکم بە نرخی نانەوردە بیدات بە تەلی حاجەت، یان بنێشتێکی کوردی.

بەڵێ، ڕامین، جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە، ڕۆژەکان کورت بوون و زەوی خێراتر دەسوورێتەوە، خێراتر... خێراتر.

# ٢٦

بە شەقامەکاندا دەڕۆین، ئۆتۆمبیلێک بەلاماندا تێدەپەڕێت. ئێمە ڕادەکەین بۆ ئەوەی پیس نەبین، فریا ناکەوین. تۆ بەجەستەی قوڕاویی من پێدەکەنیت و دەستە بچووکەکانت بە دەمتەوە دەگریت. ڕۆژ دوای ڕۆژ گەورەتر دەبیت، منیش زیاتر عاشقی تۆ دەبم. زۆر جوان و ناوازە و گوێڕایەڵیت، ئەڵبەت من نامەوێت گوێڕایەڵ بیت، من دەمەوێت عەجول بیت و شت بشکێنی و یاریی زۆر بکەیت. نەنکت پێی وایە لە من دەچیت. شەوان داوا دەکەیت باوکت بە کاغەز بەلەمت بۆ دروست بکات، تا بە دەریادا گەشت بکەیت.

دەتوانیت بەباشی بە پێیەکانی خۆت بڕۆیت و بەباشی بدوێیت. بۆ هەموو شوێنێک لە تەنیشتی منەوە ئامادەبیت هەیە، تەنانەت بۆ سەر کارەکەشم. کردوومانە بە بەرنامە هەموو ڕۆژێک دوای تەواوبوونی کارەکەم، دەتبەم بۆ ئەو پارکەی لەسەر ڕێگەکەماندایە. کاتێک جۆلانە دەکەیت، داوا دەکەیت توندتر پاڵت پێوە بنێم، تا بەرزتر بفڕیت و لە هەوادا خۆت ببینیت. پرسیاری زۆر دەربارەی سروشت و گەردوون و دروستبوونی شتەکان و خودا دەورووژێنیت، کە هەندێک جار منیش وەڵامەکانم لەلا نین، وام لێ دەکەیت بەدوای وەڵامەکاندا بگەڕێم. جیاوازی زۆرە لەنێوان شتێک کە لێی تێناگەیت، لەگەڵ شتێک کە گومانت لێی هەیە،

تۆ هەم تێناگەیت، هەم گومانیشت هەیە.

کاتێک ژنێک دەبێت بەدایک، ئیدی منداڵەکەی دەبێتە باشترین هۆکاری بەردەوامیی ژیانی، تۆ بوویت بە ئیمتیازی ژیانی من.

ناتوانین خۆمان لەو چاوانە حەشار بدەین، کە دەیان پرسیاریان هەیە دەربارەی من و تۆ. کاتێک بەو دەنگە ناوازەیەت بانگم دەکەیت (دایکە)، ڕاستەوخۆ پرسیاری ئەوە دەکەن، ئایا من دایکی تۆم؟ کاتێک وەڵامی (بەڵێ) وەردەگرن، چەند سانتیمەترێک دەمیان دەکەنەوە و بۆ شاردنەوەی ددانیان، دەست بە دەمیانەوە دەگرن و پرسیاری بێماناتر دەکەن. ئەوان پێیان وایە من منداڵم و چۆن دەکرێت منداڵێکی وەکوو تۆم هەبێت؟ بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، من منداڵ نیم، من دەتوانم تۆ پەروەردە بکەم و بەباشی چاودێریت بکەم. ڕۆژی جارێک بتبەمە گەرماو و بتشۆم. لە کاتی دیاریکراودا خواردنت بدەمێ و یاریت لەگەڵدا بکەم و نەهێڵم هەست بە بۆشایی بکەیت. ئامادەم تەواوی خۆم بۆ باشی تۆ ئامادە بکەم. خەڵکی ئیرەیی بە دایکایەتیم دەبەن. زۆر نیگەران دەبم کە خەڵک پێیان وایە من منداڵم، هەندێک جار دڵم پڕ دەبێت.

لە هەموو جێگەیەک پرسیاری «ئایا من دایکی تۆم؟» ئامادەیی هەیە. پێکەوە سەفەر دەکەین بۆ شارێکی دی، تۆ لە باوەشمدا نوستوویت، لە یەکێک لە بازگەکاندا دامان دەگرن و داوای ناسنامەی تۆم لێ دەکەن، پێیان وایە من دایکی تۆ نیم. نزیکی نیوکاتژمێر ڕامان دەگرن، خۆشبەختانە تۆ بە دایکە بانگم دەکەیت و ئەوانیش باوەڕ بە دایکایەتیم دەهێنن و ڕێگە دەدەن بڕۆین. لە کۆڕەکانمدا تۆ دەبینم لە ڕیزی گوێگرەکاندا دادەنیشیت و بەوردی گوێ بۆ من دەگریت کاتێک شعر دەخوێنمەوە. من سەیرت دەکەم، پێکەنینم بە قاچە کورتەکانت دێت، کە لەسەر کورسییەکە ناگەنە زەوی، بەڵام دڵنیام لەوەی ڕۆژێک ئەو پێیانەت دەگەنە زەوی و زەوی لەژێریاندا دەلەرزێت.

# ٢٧

لـه سـەربانەکە، جلی سـەر تەنافەکـە لێدەکەمـەوە، نیگام دەچێتـە سـەر هێلانـەی کووکووختییەک بە گوێسـەبانەی هەورەبانەکەوە. سەبەتە جلەکە دادەنێم و کورسییەک دەهێنم و دەچمە سـەری، دەستم پێی ناگات، پاشان تەختەیەکی دانیشتن دەهێنم و دەیخەمـە سـەر کورسییەکە، زرم دەکەومـە خوارەوە، دیسـان هەڵدەستم و هەمان شت دووبارە دەکەمـەوە. دوو هێلکە لەنـاو هێلانەکـەدا دەبینـم، دەری دەهێنـم و هەتـا دەسـتم دەیانگرێ هەڵیان دەدەم بۆ سـەربانەکەی ماڵی ئەمنە خـان. هەتـا مـن لـەم ماڵەدا بم، پشیلەکان بۆیـان نییـە بەچکەیـان ببێـت. گـەڵاکان نابێـت ببـن بـە دووان. جاڵجاڵۆکـە ئەگـەر هێلانـە دروسـت بکات، قەتڵ و عـام دەکرێت. کۆتـر هەڵـە بکات هێلکە دەکات. ئەگـەر بـۆم بکرێـت، یاسـایەک دەر دەکـەم هەمـوو لەدایکبوونێک لـە تـەواوی گـەردووندا قەدەغـە دەکـەم. تەماشـا کـە ڕامین، مرۆڤی تووڕە چەند ترسناکە، تەماشا دایکی دوورخراوە لـە منداڵەکانی، چ ئاگرێکی ئیرەیی لە ناخیدا هەڵدەگیرسێت، تەنانـەت ئیرەیی بـە باڵندەکانیش دەبات.

بـە سـەبەتە جلەکـەوە دەچمـە خـوارەوە، سـێلیم جلـە بچکۆلەکانی تۆ و هانیکۆی لە کەنتۆرەکـەدا دەر هێنـاوە سـەیریان دەکات، بەسـەریدا دەقیژێنم، کـە هیچکـەس بـۆی نییـە دەسـت لـەو جلانـە بـدات. نامەوێت بۆنی کـەس

بگرن، دەبێت هەر بەو بۆنەی خۆتانەوە بمێننەوە. سێلیم دەحەپەسێ و سەیرم دەکات.

سێلیم کچێکی باشە، تەمەنی نزیکەی سیوپێنج ساڵێک دەبێت، خەڵکی مەکسیکە و خاڵە لە مەکسیکەوە هێناویەتی، چونکە نەنە پیر بووە و ناتوانێت ئیشی ناو ماڵەکە بکات. ئەو زیاتر لە هەرکەسێک لە من نزیک بۆتەوە، یانی دەتوانێت بەباشی لە هەستەکانم تێبگات. کاتێکیش باسی ئێوەی بۆ دەکەم، دەگری. هەندێک شەو کە دەزانێت نیگەرانم، بەتەنیا لە ژوورەکە بەجێم ناهێڵێت، دێت و لەسەر جێگەکەی من دەنوێت. لە ماڵی نەنەدا تەنیا من و نەنە و سلیم و کەروێشکێکی قاچاغ و پشیلەیەک بوونمان هەیە.

ژوورەکەی من لە نهۆمی دووهەمە، پەنجەرەیەکی گەورەی هەیە، لەوێوە دەتوانم تەواوی کۆڵانەکە ببینم، هەروەها حەوشەی ماڵە دراوسێکانیش. لەوێوە دەتوانم منداڵەکانی کۆڵان و باڵای دارتووەکان و هاتووچۆی ڕێبوارەکان ببینم. وەک شاشەیەکی تیڤی، دەتوانم فیلمەکانی گەرەک ببینم. ئێرە سەر زەمینی خەیاڵەکانمە. لێرەوە دەتوانم سەفەری گەورە گەورە بکەم. لە دەرەوەی ئەم ژوورە، ژیان زۆر بچووکە. ڕامین بۆ ئەوەی ژیان تەحەمولکراو بێت، پێویستە دونیایەکی تایبەت بە خۆمان دروست بکەین. من بۆ هەمیشە لە ماڵی نەنە نیم، ئەڵبەت کاتەکانم دابەش کردووە لەنێوان ماڵی نەنکت و نەنکمدا. لە مانگێکدا نزیکی دوو هەفتە دێمە ئێرە و دەڕۆم، بەڵام هاتنی ئەمجارەم، کەمێک جودایە و چەند مانگێکە لێرەم، دەزانیت بۆچی، ڕامین؟ ڕەنگە وەکوو خەونێک بیرت بێتەوە، جارێک لەگەڵ خوشکەکەتدا هاتیت بۆ لام، هانیکۆ دیسان منی نەناسیەوە و لەلام نەمایەوە، بەڵام تۆ بە بست لێم دوور نەدەکەوتیتەوە. لەسەر تۆ ناکۆکی کەوتە نێوان من و دایکمەوە، لەسەر منیش ناکۆکی کەوتە نێوان دایکم و دایکییەوە، واتە نەنە. لێم مەپرسە هۆکارەکەی چی

بوو. تۆ لەگەڵ پوورە بچکۆلەکەت سەرقاڵی یاریکردن بوویت و لە ناخی دڵەوە پێدەکەنیت، باوەڕم وایە زۆر دەمێک بوو بەو جۆرە پێنەکەنیبوویت. من بە دایکمم وت، کە دەڕۆم و هەرگیز ناگەڕێمەوە. بەرەو لای تۆ هاتم، نەمدەویست پێکەنینەکەت بشێوێنم، بەڵام ناچار بووم ئەوە بکەم. بانگم کردیت

«ڕامین... »

ئاوڕت دایەوە و تەماشایەکت کردم، کە بینیت دەگریم، ڕاستەوخۆ پێکەنینەکەت گۆڕا بۆ جۆرێک لە سەرسامی. هەزار پرسیارم لە چاوتدا دەخوێندەوە. پێم وتیت با بڕۆین، تۆیش بێ ئەوەی پرسیاری ئەو شوێنەم لێ بکەیت کە بۆی دەچین، ڕاستەوخۆ هەستایتە سەر پێ و چاوەڕوانی من بوویت. جانتاکەم هەڵگرت، دەستە بچکۆلانەکانتم گرت و ڕۆیشتین. نەنە زۆر لێم پاڕایەوە، کە ئەوە نەکەم، بەڵام من زۆر لەوە کەللەڕەقتر بووم، کە نەنە بیری لێ دەکردەوە. بۆ من شکاندنی دڵێک پێویست بوو بۆ ئەوەی لە هەمبەر ئەو هەلومەرجەدا پەرچەکردار نیشان بدەم، چاویلکەکەم لەچاو کرد، تا تۆ و خەڵکی گریانەکەم نەبینن. بە شەقامەکەدا دەڕۆیشتین، ئۆتۆمبیلەکەی باپیرتمان بینی بەلاماندا ڕۆیشت، نەنکت و پوورەکانت و باپیرتی تێدا بوو، بەڵام نەوەستان. تۆ ویستت بانگیان بکەیت، من دەستەکانتم گوشی و پێم وتیت شتی وا نەکەیت. ڕامین، هەندێک شت لە ژیاندا وەک وێنەیەک دەمێننەوە لای مرۆڤ، کە هەرگیز ناتوانین لەبیریان بکەین، تەنانەت کاڵیش نابنەوە، هەندێک جار وامان لێ دەکەن، کە زیاتر پێ لە ژیان توند بکەین.

شەقامەکانمان بڕی و چووینە پارکێک. تۆ خەریکی یاریکردن بوویت، منیش لەبیری چارەسەرێکدا بووم. ڕۆژ خەریک بوو ئاوا دەبوو. خۆرم دەبینی دەتگوت پرتەقاڵێکی گەورەیە و لەودیو پەرژینی پارکەکەوە دانراوە. منداڵان لەگەڵ جۆلانەکاندا دەفڕین. مراوییەکان لە حەوزەکەدا

وێنەی ئاسمانیان دەشێواند. من و تۆ لەگەڵ کورسیکورسییەکاندا چووین بۆ لای هەورەکان. لەولامانەوە ژن و پیاوێک تەمەننای منداڵیان هەبوو.

هەستم کرد بیری هانیکۆ دەکەیت، پێت وتم:

«دایکە، سبەی دەچین هانیکۆ دەهێنین و جانتاکەی مەکتەبیشم. ئیدی هەر لەلای تۆ دەبم، ناڕۆمەوە.»

توند بە خۆمەوە دەتنووسێنم، خۆم پێ ناگیرێت و دەگریم، سەرشانی تۆ تەڕ دەبێت. تەنانەت ئێستاش کە ئەم چەند وشەیە دەنووسم و بیرم دەکەوێتەوە، دەگریم. بۆ دایک زۆر قورسە داواکاریی منداڵەکەی ڕەت بکاتەوە، من نەمتوانی ئەو داواکارییەی تۆ جێبەجێ بکەم، بمبوورە، کەروێشکە بچکۆلانەکەم.

دونیا تاریک بوو، شەو ئامادەیی خۆی سەلماند. بە شەقامەکاندا دەسووڕاینەوە، گڵۆپەکان دونیایان ڕووناک کردبووەوە، بەڵام دونیای من نا. تۆ نەتدەپرسی بۆ کوێ؟ ئەوەندەت بەس بوو، دەستە بچووکەکانت لە دەستمدا بوون و لە نزیکی من خۆت دەبینی. ئەوەندە دڵخۆش بوویت، بیری نانخواردنت نەبوو. دوو پیتزامان کڕی و لە پارکی نالی پێکەوە دانیشتین. تۆ ئەو شەوانەت بیر خستمەوە، کە پێکەوە هاتووین بۆ ئەو پارکە و تۆ جۆلانەت کردووە. پێت وتم شەوێکیان منیش لەگەڵ تۆدا خلیسکێنەم کردووە. بیرم دەکەوێتەوە و پێدەکەنم. پێم دەڵێیت:

«دایکە، کە پێدەکەنیت، زۆر جوانیت.»

«دایکە، دایکی هاوڕێکانم هەموویان گەورە و بەتەمەنن، بەڵام تۆ زۆر جوانیت، ئەو کاتەی هاتی بۆ قوتابخانە بۆ لام، مامۆستاکەم وای زانی تۆ خوشکی منیت.»

من هەر بێدەنگم. ئەمجارە تۆ زیاتر قسە دەکەیت، چونکە دەتەوێت من بێمە قسە.

«دایکە، ئێوارە بۆچی گریایت؟»

دیسـان دڵـم پڕ دەبێ و دەگریـم. دەمەوێت تـۆ گریانەکـەم نەبینیت. سـەرم دادەخـەم و خـۆم بـە نینۆکەکانمـەوە خەریـک دەکـەم، خێرا لـە پرسـیارەکەت پاشـگەز دەبیتـەوە. دەڵێیـت:

«گاڵتەم کرد.»

لە چاوەکانتدا گڵۆپی سەر شەقامەکە دەدرەوشایەوە.

ڕامیـن، پێویسـتە جارجـار دەسـتێک هەبێ و غەریبیـت ڕاچڵەکێنێت. تـۆش پێـت وا نییـە؟

پێت دەڵێم:

«ڕامین، لەکوێ بنوین؟»

دەڵێیت:

«دەچیـن بـۆ ماڵـی پـوورم، خـۆ لێـرەوە زۆر نزیکـە، ئـەو کاتـە مـن لـە باوەشـتدا دەنـووم.»

تۆ ڕاستت دەکرد، ماڵی خوشکەکەم چەند مەترێک لە ئێمەوە دوور بوو. مـن و خوشکەکەشـم لەسـەر یـەک خـاک چەکەرەمـان کردبوو، کە منداڵدانی دایکمـان بـوو، بـەڵام خۆمـان زۆر لـە یـەک دوور بوویـن. دونیـای مـن و پوورت زۆر جودا بوو. تـازە هەفتەیـەک بـوو کێشـە کەوتبووە نێوانمانەوە. ئـەو پێـی وا بـوو مـن خـۆم بـە ڕووی دونیـادا داخسـتووە و پێویسـتە لـەو دونیایـەی تێیـدام، بێمـە دەرەوە و ژیانێـک دروسـت بکـەم. ئـەو زۆر سـادە پێـی وا بـوو، دەبێـت ئەڵقـەی پیاوێـک لـە پەنجـەم بکـەم و بەختەوەریـی مـن گرێدراوە بـەوەی لـە کۆشـکێکی چەنـد نهۆمیدا بژیـم، ماڵـی خۆمـم هەبێ و پیاوێـک بخەمـە سـەر پشـتییەکەم، ئـەو کاری بەسـەر کارەسـاتەکانی دونیاوە نییـە، ئەوەنـدەی بەسـە لـە مۆدێلـی جلـەوە بەرامبەرەکـەی هەڵسـەنگێنێ. ئـەو سـادەژنە پێـی وا بـوو ئـەو هەمـوو بۆشـاییە گەورەیـەی مـن هەمـە، ئـەو

هەموو کەلەبەرە زۆرەی لە وجودی مندا هەن، بە بوونی پیاوێک و پیاوێک پڕ دەبنەوە. ئەو پێی وا بوو کۆشکێک دەتوانێت من ئامادەییی بکات. بیهێنە بەرچاوی خۆت، کۆشکێکی کۆنکرێتیی ڕازاوە بە بەختەوەر دونیای مۆدێرن و دوورخراوە لە سادەیی و خاکیبوونی ژیان، دەتوانێت کەسێکی وەکوو من بەختەوەر بکات؟ منێک، کانتۆری جلەکانم لەجیاتی کراس و جلی ئاخر مۆدێل، پڕ کردبوو لە کتێب. ڕامین، من نەک کۆشکێک، بەڵکوو تەواوی زەوی ناتوانێت بەختەوەرم بکات. هەست دەکەم زەوی زۆر بچووکترە لەوەی بتوانێت وەڵامی پرسیارەکانی من بداتەوە و شتگەلێکی تێدا بێت بتوانێت بەختەوەریی من دەستەبەر بکات، ئەگەر ڕاستت بوێت، لە ژیاندا شتێک نییە بە ناوی بەختەوەری. بەختەوەری شتێکی فریودەرە، مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بەختەوەر بێت. مرۆڤ بوونەوەرێکی فریوخواردووە. ئەمرۆمان بە پلاندانان بۆ سبەینێ و بە ئومێدی گەیشتن بە بەختەوەری بەڕێ دەکەین، سبەینێش بە هەمان شێوە، بەم جۆرە هەموو ژیان لە چاوەڕوانی و لەپێناوی بەختەوەربووندا بەڕێ دەکەین، بەڵام وەک وتم، شتێک نییە بە ناوی بەختەوەری. ئەمە یارییەکە، ژیان لەگەڵ ئێمەدا دەیکات، چونکە ئەگەر ئومێدی بەختەوەربوون نەبێت، ژیان تامێکی نەدەدا و زۆربەمان لە ژیان هەڵدەهاتین، زۆربەی ئەو مرۆڤانەی ڕۆژانە لە ژیان هەڵدێن و لە یارییەکە دەچنە دەرەوە، ئەوانەن کە بڕوای تەواویان بەوە هێناوە بەختەوەری بوونی نییە و لە چۆنیەتی یارییەکە تێگەیشتوون، لەو کاتەدا بڕیار دەدەن کاتژمێرەکە بوەستێنن. ڕەنگە ئەوەی خەڵکی ناوی دەنێن (بەختەوەری)، دڵخۆشییەکی کاتی بێت. هەندێک پێیان وایە بەختەوەری بە بوونی ماددە و شتە دونیاییەکان، یان پلە و پۆستێک دەستەبەر دەبێت، هەر بۆیە تەواوی ژیانیان بە ڕاکردن بەسەر دەبەن بۆ بەدەستهێانی ئەو بە-ناو-بەختەوەرییەی مەبەستیانە، بەڵام ڕامین، دڵنیا بە نەک بەختەوەری، بەڵکوو دڵخۆشی ڕاستەقینەش

هەرگیز پابەند نییە و نەبەستراوەتەوە بە شتە ماتریالّی و ماددیەکانەوە.

تۆ سوور بوویت لەسەر ئەوەی بچینە مالّی پوورت، بەلاّم من ڕەتم کردەوە. کێشەی من ئەوە بوو، لە هیچ جێگەیەک ئاسوودە نەدەبوم. کرمێک لە مندایە و وام لێ دەکات نەتوانم لە هیچ جێگەیەک سەقامگیر بم. لە ژیاندا هیچ شتێک لە سەقامگیری خۆشتر نییە. هەستام و بڕیارم دا بچینەوە مالّی نەنە. نەمویست نەنە تەندروستیی تێک بچێت و نیگەرانی بکەم.

ئەو شەوە لەپالّ مندا نوستیت. لە پەنجەرەکەوە مانگم دەبینی باوێشکی دەدا. گوێم لە دەنگی سیسرکەکان بوو، بۆقەکانیش. دەمتوانی هەست بە هێمنیی شەو بکەم. پەردەکە تا بەیانی سەمای کرد، قەلّەمتۆزەکەیش، کە ڕۆژ بووەوە، ماسیحەکە و سلیمیش.

# ٢٨

خۆم دەبینم بەسەر پشتی بوونەوەرێکەوەم لە بۆشاییی ئاسماندا. دڵنیا نیم ئەو بوونەوەرە باڵندەیە، یاخود گیاندارێکی کێوی. لەبەر سەرسامیم بە کەشی ئاسمان و وردبوونەوەم لە خوارەوە، ناپەرژێمە سەر ئەوەی وردتر لێی بڕوانم و بزانم سەر بە کام جۆری گیاندارانە. دوو کەس دەستەڕاست و دەستەچەپیان گرتووم. دەستەڕاستم ژنێکە، تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵ دەبێت، دەستەچەپیشم کچێکی چکۆلانەیە، ڕەنگە چوار ساڵێکی تەمەن بێت.

قژم بە هەموو لایەکدا پەرش بووە. هەست بە قورساییی جەستەم ناکەم. تا دێت بەرزتر دەبینەوە، درەختگەل و کێڵگە و دارستانەکان بچووکتر دەبوونەوە. باڵەخانەکان وەکوو تەڵی شقارتە دێنە بەرچاو، تا وای لێ دێت، شارەکەمان وەکوو تاشەبەردێکی لێ دێت، بەردێک لەناو هەزاران بەرد. تا بەرزتر ببینەوە، زەوی بچووکتر دەبێتەوە. زەوی لە دوورەوە لە هێلکەی قازێک دەچێت، دڵم بەم فڕینە خۆشە. چینەکانی سەرەوە تاریکن، دەنگگەلی سەمەرە دەبیستم، وەکوو دەنگی بوونەوەری ناسروشتی، زمانی ناسروشتی. لەناکاو ئێوە دەبینم بەرەو ڕووم دێن، بەتاسەوە باوەشتان بۆ دەکەمەوە، بینینتان دڵخۆشییەکەم دە هێندە

دەکات. هانیکۆ بەرەو ڕووم ڕادەکات و پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی من بەتوندی باوەش بە ژنەکەی دەستەڕاستمدا دەکات و پێی دەڵێت (دایە). لە تووڕەییدا شێت دەبم. بە هەمان شێوە، تۆش دەبینم باوەش بە کچە چوار ساڵەکەی دەستەچەپمدا دەکەیت، ماچی دەکەیت و بە (دایکە) ناوی دەبەیت. تووشی سەرسووڕمانێکی سەیر دەبم، سەرسووڕمانێک، چەندین چەرخە کەس هەستی پێ نەکردووە و بەری نەکەوتووە.

بەو ڕاستییە دەگەم، کە ژنەکەی دەستەڕاستم خۆمم لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا و کچە چکۆلەکەی دەستەچەپیشم، هەر خۆمم لە تەمەنی منداڵیدا. خۆم دەبینم لەنێوان دوو زەمەنی جیاوازدا واقم وڕ ماوە، زەمەنی منداڵی و زەمەنی پیری.

من بووم لەنێوانی دوو زەمەندا وێڵکراو و نەبینراو، زەمەنی دەستەڕاست و زەمەنی دەستەچەپ.

لەنێوان مێژوو و داهاتوومدا، زەمەنێکی دیارینەکراو بووم. وەکوو تەمێک خۆمم دەبینی، وەکوو گریمانەیەک کەوتوومەتە نێو زەمەنێکی گەردوونیی بێسنوور و بەرفراوانەوە، کە یەک چرکە لە کاتی گەردوون، ڕەنگە یەکسان بێت بە هەموو ژیان لە زەویدا. دەقیژێنم و بە زمانی کوردی بانگتان دەکەم، وەک زمانی مرۆڤێک. ئێوە گوێتان لێم نییە و تەنانەت ناشمبینن.

لە دەنگی قیژەی خۆم بەئاگا دێمەوە. هەناسەم سوار دەبێت، جەستەم سەراپا لە ئارەق هەڵکێشراوە. ترسێکی سەیر دام دەگرێت و هەموو گیانم دەلەرزێت. هێزی ئەوەم نییە هەستم، قاچەکانم ناجووڵێن. تەمەنای بوونی کەسێک دەکەم لە تەنیشتمەوە، تا بمهێنێتەوە سەر خۆ. بەئاستەم دەستەکانم دەجووڵێنم و لامپەکەی لای سەرم هەڵدەکەم.

ئەم ماوەیە بەر شتی سەیر و خەونی سەیر دەکەوم. ئەم شتانە،

ئەم خەونانە، بەخراپی دەمترسێنن، بەقووڵی دەموەستێنن. لە دەرەوەی هێز و توانای من، کارم تێدا دەکەن. هەموو ئەم شتانە وام لێ دەکەن وەکوو چۆلەکەیەک بە دوو باڵی شکاوەوە لە ئەرزدا بسوورێمەوە و لە خۆڵ و قوڕدا غەرق بم. وڕ و گێژ بە سەرئێشەیەکی قورسەوە بە ژیاندا دەسوورێمەوە.

خەونە سەیرەکان مەبەستیانە بەرەو دەرگایەک بمبەن، دەرگایەک، کە ناکرێتەوە.

لە خەونەکەمدا بەڕاستی هەستم بە بچووکی زەوی کرد، زەوی، کە لە وشەیەکدا جێی دەبێتەوە.

دایکم هەندێک بەیانی سوێند دەخوات دوو سەد جار هەمان خەونی شەوی پێشووی بینیوە. خەونە دووبارەکان دەیانەوێت چی بە ئەنکت بگەیەنن، ڕامین؟ ئەی بە دایکت چی؟

خەون شوێن و کات تێکەڵ بە یەک دەکات و لەو سۆنگەیەوە دەست بۆ هەندێک ڕاز و نهێنی دەبات.

بەر لە دوو هەفتە لەگەڵماڵەوە چووین بۆ سەر دەریا، وەک هەمیشە هەردوو دەستم لە گیرفانەکانم ناو بەوردی تەماشای ناوەڕاستی دەریاکەم کرد. لەناکاو تەمێکی تەڵخ لە ناوەڕاستی دەریاکەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا. باوەڕم بە چاوەکانی خۆم نەکرد، چاوەکانم چەند جارێک سڕی و دووبارە تەماشام کردەوە، دووبارە دەمبینی تەمێک بەرەو ئاسمان بەرز دەبووەوە. بانگی ئەوانی ترم کرد و هەوڵم دا پیشانی ئەوانیشی بدەم، بەڵام ئەوان بە قسەکەی من پێکەنین و هەروەها تەمێکیان بە ڕەنگی خەیاڵەکانم ناوزەد کرد. من نیگەران بووم لەوەی وەک منداڵێکی سەرەتایی تەماشایان کردم، هاوکات باوەڕیشم هێنا، کە ئەو تەمە دروستکراوی خەیاڵەکانمە. پاشان چی ڕووی دا؟ کە

گەیشتینەماڵەوە و تەماشای وێنەکانم کرد، دەزانی چیم بینی، ڕامین؟ ئەو تەمە لە هەموو ئەو وێنانەی من گرتبوومن، لە پشتمەوە و لە ناوەڕاستی دەریاکەدا بەڕوونی دەر کەوتبوو، ئەمە لە کاتێکدا پوورت لە هەمان جێگەدا وێنەی گرتووە، بەڵام لە وێنەکانی ئەودا، ئەو تەمە بوونی نییە. (ئەگەر بتەوێ، دەتوانیت ئەو وێنانە ببینی).

ئەمەش چەند ڕۆژێک خستمیە بیرکردنەوە و بە دەرئەنجامێکی ڕوون نەگەیشتم. ژیان تەنراوە بە چەندین خەونی سەیر و تەمی سەیر، ڕەنگە ئێمەش تەمێک بین، کێ دەزانێت؟

# ٢٩

لە سەربانەکە قاچ دەخەمە سەر قاچ و بەقژێکی بژەوە گوڵەبەڕۆژە دەترووکێنم، توێکڵەکان بە زەویدا بڵاو دەکەمەوە، گوێ بەو کەسانە نادەم، کە هەمیشە لە شاشەکانەوە هاوار دەکەن و بانگەشەی پاکڕاگرتنی ژینگە دەکەن، ئەوان ئەگەر ڕاست دەکەن، با ژینگەی مرۆڤایەتی لەو توێکڵانە پاک بکەنەوە، کە زەوییان پیس کردووە (توێکڵی ڕەقی مرۆڤ).

دەست ڕادەوەشێنم و دەنک دەنک توێکڵ هەڵدەدەمە ماڵی ئەمنە خانەوە، لەناکاو هەست بە ئازاری قۆڵم دەکەم، ئاسان نییە بۆ هەردەنکێک، دەستێک ڕاوەشێنیت.

هەڵدەستم و ڕوو دەکەمە دراوسێی دەستەچەپ، خراپ نییە جارجار ڕووی قینەکانت وەرسووڕێنی.

بیرکردنی ئێوە، خەریکە ناوەوەم دەخوات.

هەتا ناوقەدم شۆڕ دەکەمەوە، تەماشای نەعلە تاکەوتاکەکانی دراوسێی دەستەچەپ دەکەم، لەو ماڵەدا کە ژیان تێیدا تاکەوتاکە.

دەمەوێت لە ڕێگەی نەعلەکانەوە منداڵەکانی نێو ئەو ماڵە ئەژمار بکەم. تەماشا مرۆڤ چ بوونەوەرێکی خۆهەڵقورتێنە. مرۆڤ دەستکاری

سروشتی کرد و خۆی لە کاری گەردوون هەڵقورتاند. تەماشا چۆن ڕەگەزو تایبەتمەندیی توخمی دوو درەخت تێکەڵ دەکەن و ناوی دەنێن (موتوربە).

هێلکەی بێ مریشک دەکەن بە جووجەڵە، جووجەڵە لە ماوەی مانگێکدا دەبێت بە چوار کیلۆ.

بڕوانە چۆن بە چەندین شێوە گەشەی سروشتیی شووتییەک خێرا دەکەنەوە. مرۆڤ ژیان خێرا دەکاتەوە.

لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە، کێڵگەیەکی تایبەت بە بەرهەمهێنانی شووتی، شووتی چوارگۆشەیان دروست کردوە. دەبینی دەستێوەردانی مرۆڤ گەیشتۆتە چ ئاستێک؟ ئەمە دروست بەو ڕاستییەت دەگەیەنێت، کە مرۆڤ بوونەوەرێکی خۆهەڵقورتێنە، دەنا چ نەنگییەکی تێدایە شووتی خڕ بێت یان چوارگۆشە؟

داروین کاتێک باس لەوە دەکات، کە مرۆڤ پێشتر ئاژەڵ بووە و ئێستا گەیشتۆتە پلەی کەماڵی خۆی کە مرۆڤە، هەڵە دەکات، چونکە مرۆڤ کاتێک بوو بە مرۆڤ، کەماڵیی خۆی لەدەست دا.

بە گێژەگێژ دێمەوە ژوورەکەی خۆم.

لە پەنجەرەکەوە چاوم لێیە خاڵت و پوورت دەنگەدەنگیانە.

نەنە دەڵێت:

«لە حەوشەکەدا هەرا مەنێنەوە، دەنگتان دوور دەڕوات، وەرنە ژوورەوە، دەرگاکە دابخەن، ئەوسا دونیا وێران بکەن.»

نەنەش پێی وایە ئەمدیو دەرگا جێگەی دەنگهەڵبڕینە. دەتوانیت لەمدیو دەرگاوە، هەموو نەگوتراوێک بڵێیت. لەمدیو دەرگاوە، دەتوانیت سەری بەرامبەر و سوراحی و دڵەکانیش بشکێنیت و کەسیش پێت نەزانێت.

لەبەر ئەمەیە مرۆڤ لەگەڵ دروستبوونیدا هەوڵی دروستکردنی

شوێنێکی تایبەت بە خۆی دا، بە ناوی (ماڵ). مرۆڤ هەر لەو کات...
هەستی بە دەمامکەکانی خۆی کرد، لەو کاتەوە حەزی کرد نهێنیی هەبێت.
دەتوانیت لەمدیو دەرگاوە خۆت ڕووت بکەیتەوە، مەبەستم تەنیا فڕێدانی جلوبەرگ نییە، بەڵکوو فڕێدانی ئەو دەمامک و بەرگانەیە، کە لەگەڵ خەڵکیدا دەیانپۆشیت، داکەندنی ئەو پێستەیە، کە لەودیو دەرگاوە جۆرێکی ترە. هەموومان لەودیو دەرگاوە جۆرێکین، لەمدیو دەرگاوە جۆر و ڕەنگێکی تر.

زۆربەمان لە دەرەوە، لە دەرەوەی خۆمانین و کە دێینە ماڵەوە، خۆمان لە خۆمان دادەکەنین و لە ئاوێنەکەدا ئەو قالۆنچەیە دەبینین، کە لەمدیوی دەرگاکانەوە بوونی هەیە. ئەمە لە کاتێکدا، ئەگەر ئاوێنەیەک بوونی هەبێ و لە بوونی ئاوێنەشدا جورئەت و ویژدانێکیش ئامادەیی هەبێت بۆ تەماشای ئاوێنە و بینینی خودی خۆمان، خۆمان بەبێ ماکیاژ و دەمامک، چونکە هەندێکمان بەبێ ماسک ئەوەندە ترسناکین، تەنانەت خۆشمان بوێریی ئەوەمان نییە تەماشای خۆمان بکەین لە ئاوێنەکەدا.

لای هەندێکیش هاوکێشەکە پێچەوانە دەبێتەوە و لە ماڵەوە هەڵگری چەندین ماسک و دەمامکە.

ماڵەکەی ئێمە لە ڕووخساری مامۆستا پاکیزە دەچێت، کە هەمیشە بە ماکیاژی مارکەی لۆریاڵ سواخ دراوە، تا چاڵوچۆڵی و چرچولۆچییەکان بشارێتەوە.

ماڵەکەی ئێمەش لە دەرەوە تەشتێک ئارایشتی کردووە و وەک جوانترین باڵەخانەی گەڕەک دەر دەکەوێت، لێ لەمدیو دەرگاکەوە پڕە لە چاڵوچۆڵی و چرچولۆچی. هەندێک جار دەکەومە درزێکەوە، بەزەحمەت دێمە دەرەوە، درزی گەورەی ژیان.

لەم ماڵەدا هەست دەکەیت لەنێوانی زەوی و ئاسماندا گیر ماویت، یان

شتێک وەکوو چەقی هەوا، چەقی ئەو بۆشاییيەی کەوتۆتە نێوانی زەوی و ئاسمانەوە. پێچەوانەی ماڵی نەنکت، ئاسمان لێرە زۆر دوورە.

رامین، ماڵەکان حیکمەتێکیان تێدایە، کە من درکم پێ نەکردووە. نهێنییەک هەیە، وا دەکات تەنانەت مێرووەکانیش هەوڵ بدەن ماڵێکی تایبەت بە خۆیان هەبێت، ئەگەر ئەو حیکمەتە ئارامی و ئاسودەیی بێت، ئەوا من درکم پێ نەکردووە. هەست دەکەم ئارامیی من لە هیچکام لە ماڵەکاندا بوونی نییە، نە ماڵی نەنکت و نە ماڵی نەنکم و نە ماڵی باوکت و نە ماڵی خودا، نە مزگەوت و نە کەنیسە و نە نیشتمان و نە زەوی و نە دڵێک، ڕەنگە ئارامیی من لە ماڵێکدا بێت، گەورەتر لە هەموو ئەمانە، کە من هێشتا نەمدۆزیوەتەوە و بەدوایدا دەگەڕێم.

کەشی ماڵەکە ئارام بۆتەوە. پوورت لە بەردەم جامەکاندا زیپکە دەتەقێنێ، تەواوی ڕۆژ گیراوەی لیمۆ و هەنگوین بە ڕووخسارییەوە دەبینێ. پێشنیار دەکات ئاوێنەی زیاتر لە ماڵەکەدا هەڵبواسین. لە پەنجەرەکەوە ملم دەهێنمە دەرەوە و بەدەنگی بەرز دەڵێم:

"پێویستە ئاوێنەی گەورە لە ماڵەکانماندا هەبن، بۆ ئەوەی بەباشی خۆمان ببینین، بەباشییی!"

ئەو بە باڵایەکی بەرز و ئەقڵێکی کورتەوە دڵی بە هاوسەری داهاتووی خۆشە. شانازی بە ماڵێکی دوونهۆمی و ئۆتۆمبیلە کیلۆمەترسفرەکەیەوە دەکات، کە بڕیارە ساڵی داهاتوو هەیبێت. ڕامین، تۆهەمیشە شانازی بەو شتەوە بکە کە هەتە، تەنانەت ئەگەر بایەخیشی نەبێت، نەک بەوەی نیتە و بەتەمای هەتبێ.

نەنکم دەڵێت:

"بۆ ئەوەی چاوم بڕژم، شووم کرد."

وەکوو کەسێک کە خەیاڵی ڕۆیشتبێت، لەسەرخۆ دەڵێم:

«منیش بۆ ئەوەی جەستەی پیاوێک ببینم.»

هۆکارەکانی من و نەنکم لە یەک نزیکن.

لە دووری ئێوە بیانوو بە دونیا دەگرم. ڕقم لەوەیە کاتێک قسە دەکەیت، پێت بڵێن هاااا؟

حەزم لە دادانی قەڵەمە. حەز دەکەم ملوانکەی ژنێکی فەلەستین بدزم، کە مێردەکەی لە شەڕدا لە قاوغی گوللە بۆی دروست کردوە.

پێویستم بە سەفەرێک هەیە، سەفەر بەنێو دڵە دەوڵەمەندەکان و کۆشکە هەژارەکاندا.

دەوڵەمەندی هەر ئەوە نییە فراوانیی دونیا و کۆشکەکانت هەبێت، بەڵکوو ئەوەیە لە مەترێکی چوارگۆشەدا بتوانیت باش هەناسە بدەیت.

باوکت نامەیەکی بۆ ناردووم، بە کۆمەڵێک فاریزە و خاڵ و نیشانەی پرسیارەوە. تێناگەم، ئایا ئەوەندە ئاسوودەیە کە بیر لە خاڵبەندی بکاتەوە؟ لە کاتێکدا من نووسینم بیر چۆتەوە و توانای ناسینەوەی هەندێک وشەم لەدەست داوە.

تێیدا بە زمانی عاشقێک نووسیویەتی، چەندین ڕۆژە خۆی بە ڕووی دونیادا داخستووە، تاوەکوو لە دونیا دوور بێت، لە من نزیک. وشەگەلێکی درکاندووە، کە پێشتر نەیدرکاندوون. نامەکان پەیامی ڕۆحن، ئەو جێگەیەن، کە تێیاندا مرۆڤ خۆی هەڵدەڕێژێت.

دەنگی ئاوازەی داریوش بەسەر کەشی ماڵەکەدا پەخش بووە. دەمەوێت بەخەتێکی گەورە لەلای سەرمەوە بنووسم:

«جوانی بارگرانییەکی گەورەیە بۆ ژن.»

# ٣٠

بێ ئێوە ڕژاومەتە ئەم ئێوارە بێئەخلاقەوە. خۆم بە چمکێکی زەوییەوە گرتووەتەوە، دەبێت من لەچاو زەویدا چەند بچکۆلانە بم؟

بەناو بازاڕدا وەکوو شەبەحێک، وەکوو تەمێک دەسووڕێمەوە. مرڤەکان دوابەدوای یەک پەنجە بە لووتیاندا دەکەن، وەک ئەوەی نەخۆشییەکی سارییان گرتبێت. خەڵک، مرۆڤەکان بەرز و نزم بەتەنیشتی یەکترەوە تێدەپەڕن، مێروولەکان پان دەکەنەوە. کەس بیر لە مێروولە و قالۆنچەکانی سەر شەقام ناکاتەوە. کەس بیر ناکاتەوە لەژێر پێی ئەو دوو دەسگیرانەی قۆڵیان لە قۆڵی یەکدایە و بە شەقامەکاندا دەڕۆن، قسە لەسەر کڕینی تەڤزیۆنی شاشە چلودوو دەکەن، ژیانی مێروولەکان پێشێل کراوە. کەس بیر لەوە ناکاتەوە، کە مرۆڤ هەموو شتێکی بۆ خۆی قۆرغ کردووە. دڵم بە خۆرئاوابوون گیراوە. حەز دەکەم بچم بۆ گۆڕستان، هەمیشە حەزم کردووە زۆرترین کات بەسەر بەرم و نەمتوانیوە، گۆڕستان نهێنییەکی سەیری هەیە بۆ تێکەڵبوون بە خۆت و چوونەوە-ناو-خۆت و دانیشتن بەگەرمی لەگەڵ خۆتدا و دۆزینەوەی خۆت و بیرکەوتنەوەی خۆت.

رامین، زۆربەی ئێوارەکان هەست بە غەریبییەکی قورس دەکەم،

ەک ئەوە نا کە لە شار یان کەسەکانت دوور بیت، نا، بەڵکوو هەست ەکەم ئەم زەوییە هی من نییەو من تێیدا غەریبم. هەستی ئەوەی هیچ کەس نییە لێت تێبگا و تۆ نابێت لێرە بیت، کە لێرەشیت، نەدەبوو مرۆڤ بیت، دەکرا بۆقێکی سەوز یان تەماتەیەک بیت.

غوربەتی من غوربەتی شوێن نییە، بەڵکوو غوربەتی ڕۆحە. غوربەتێکە، پێوەندیی بە دەرەوەی زەوییەوە هەیە. غەریبوونی من غەریبوونێکی گەردوونییە. خۆزگە لەم تەرزی غەریبییەی دایکت تێدەگەیشتی، ڕامین!

ئەم هەستە بەر زۆربەی ئەو کەسانە دەکەوێت، کە قووڵ بەر چەمکی مرۆڤ و بوون دەکەون و پرسیاری گەورەیان هەیە لەسەر مرۆڤ و ژیان و گەردوون. هەست دەکەم تۆیش لەو جۆرەیت.

ئەم هەستە تەمێک نییە، یان باشترە بڵێم، تەمێکی ڕەش و ناشرین نییە، بەڵکوو دەکرێت وەکوو دەرگایەک ببینین، کە دەتوانین لەوێوە شۆڕ بینەوە بۆ ناو پرسیاری گەورە و ڕامانی گەورە و هەندێک جار نووسینی گەورە.

ئەها... دەمەوێت بپرسم تۆ عاشقیت؟

زۆر خۆشە مرۆڤ عاشق بێت، جا چ عەشقی خودا، مرۆڤ، یان شتێکی تر. مرۆڤ تەنیا کاتێک دەستبەتاڵە، کە عاشق نییە. ئاییی! دەستبەتاڵی چەند ناخۆشە. هەمیشە عاشق بە، تا دەستبەتاڵ نەبیت.

عەشق شتێکە پێوەندیی نە بە دڵەوە هەیە، نە بە ئەقڵەوە، بەڵکوو ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە ڕۆحەوە هەیە، چونکە عەشقیش وەکوو ڕۆح نەمرە.

عەشق شتێکە هاوشێوەی نییە لە ژیاندا. عەشق هەڵە، گریمانەی ئەوە هەیە، مرۆڤ لە ژیانیدا یەک جار عاشق بێت. هەیە ئەو هەڵەی

هەرگیز پێ نادرێت و تەواوی ژیان گەمژانە دەژی.

مرۆڤ هەتا عاشق نەبێت، لە مانای فەلسەفەی ژیان ناگات. مرۆڤی گەورە لە عەشقی گەورەوە دروست دەبێت. عەشق شەڕی گەورەی دەوێت. تۆ لەپێناوی عەشقدا شەڕی گەورە و کاری گەورە و سەفەری گەورە بکە.

کاتێک عاشقیت، بە خەیاڵ دەژیت، خەیاڵ خۆراکی مرۆڤی عاشقە. بیر لە زۆر شت دەکەیتەوە، زۆر کار دەکەیت، کە پێویست نییە بیانکەیت، یان شەرعییەتیان پێ بدەیت.

عەشق ڕەنگەکان ڕەنگ دەکاتەوە. کەسی عاشق لە خۆی دێتە دەرەوە بۆ ناو مەعشوق. مەعشوق بەقووڵی کار لەسەر وجود و بیرکردنەوە و کردار و دونیابینیەکانی عاشق دەکات. هەندێک پێیان وایە چەند جارێک لە ژیانیدا ئەزموونی عەشقی کردووە، بەڵام ڕاستت بوێت مرۆڤ لەژیانیدا یەک جار بەقوڵی عاشق دەبێت. لەمەیاندا مەبەستم لە عەشقی ڕەگەزی بەرامبەرە. یانی لەدوای یەکەمین جار عاشقبوونەوە، هەرگیز عەشقێکی تر دروست نابێت. ڕەنگە چەندین پێوەندی دروست بێت. ئەو پێوەندییانەش تەنیا بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەیە، کە کەسی ڕۆیشتوو (مەعشوق) دروستی کردووە، نەک بۆ پڕکردنەوەی خودی عەشق، چونکە بۆشاییی گەورەی عەشق، بە هیچ شتێک پڕ نابێتەوە، ئەگەر ڕاستتر لێی بڕوانیت، بەوە دەگەیت کە عەشق نامرێت، تا بۆشاییەک دروست بکات. لە ژیاندا، ئەگەر تاکسییەک جێی هێشتی، چاوەڕێی دواتر دەکەیت، بەڵام لە عەشقدا دواتر نییە.

لەدوای یەکەمین عەشقەوە، مرۆڤ تووشی سەرلێشێواوی دەبێت، لەنێو زۆربەی مرۆڤەکاندا، بۆ بوون و گەڕانەوەی یەکەمین

عەشق دەگەڕێت، بۆ ئەو مەبەستە، پەیوەندیی زۆر دروست دەکات، لە کۆتاییدا، خۆی لە چەندین شکستدا دەبینێتەوە، تەنانەت خودی خۆیشی لێ ون دەبێت، دڵنیا دەبێتەوە لەوەی یەکەمین عەشق هەرگیز دووبارە نابێتەوە.

دەنگی بەرزی ئەڵاهو ئەکبەڕ کەشی ئێوارە دەتەنێت، دەنگی نێرینەی ئایین.

ڕۆژانە پێنج جار گوێم لەم بانگەشەیە دەبێت. پێنج جار خەڵکی سەریان دادەنەوێنن.

لە دەرگای مزگەوتی گەورەوە، پیاوە پیرەکان دەبینم بە ڕیز بەتەنیشتی یەکترەوە سەریان دانەواندوە، لە دەنگی تەسبیحێکی قەزوان دەچن. پێویستە لە هۆکاری ئەم سەردانەواندنە بپرسین. ئایا ترسێکی گەورەیە لە خودا؟ یان عەشقێکی گەورەیە بۆخودا؟ یان هیچیان؟

وای دەبینم هەندێک لەپێناوی بەهەشتدا ئەو پەرستنە دەکەن و هەندێک لە ترسی دۆزەخ. کەم هەیە ببینیت تەنیا لەپێناوی عەشقی خودا، پەرستن بکات.

بەڕاست، تۆ بڕوات بە بوونی خودا هەیە؟

من هەرگیز پێم خۆش نییە قسە لەسەر بوون و نەبوونی خودا بکەم، چونکە ئەو پرسە پێویستی بە دراسەی زۆر و چڕ هەیە و هەست دەکەم من لەو بابەتە بچووکترم، لەگەڵ ئەوەشدا، ناتوانم ڕوانین و بینینەکانی خۆمت بەرامبەر ئەم بابەتە لێ بشارمەوە و پێم خۆشە دونیابینینەکانی دایکت بزانیت.

دەمەوێت بپرسم:

«ئایا تۆ باوەڕت بەوە هەیە هەموو بوونێک لە نەبوونەوە هاتووە؟»

وەکـوو بوونـی سـەرەمێکوتەیەک لـە ئـاودا. وەکـوو بوونـی تـۆ، کـە ڕۆژگارێـک نەبوویت و بوونت نەبووە، بـەڵام ئەوەتـا ئێستا بـە چەندین کیلۆوە قورساییت هەیە بەسەر زەمینەوە و بۆشاییەکت داگیر کردووە و هەیـت. دەتوانیـت پێم بڵێیت تـۆ لـە چییـەوە دروسـت بوویـت و کێ دروستی کردوویت؟ ئەگەر بگەڕێیتەوە سەر لایەنە فیزیکییەکەی و پێم بڵێیت تۆ و باوکم منتـان دروسـت کـردووە، ئـەوا پێت دەڵێم هەڵەیت، مـن و باوکـت تەنیـا هـۆکار بوویـن بـۆ دروسـتبوون و گواسـتنەوەی تـۆ بـۆ ئێرە. ئێمـە هـۆکار بوویـن، نـەک خولقێنـەر. پرسـیارە گەورەکـە ئەمەیـە:

«ئایـا خولقێنـەری سـەرەکی کێیـە؟ ئـەو هێـزە چییـە کـە تـۆی هێنایـە بـوون و خـۆی بوونـی نییـە و بۆشـاییەکی داگیـر نەکـردووە؟ ئایـا ئـەوەی بۆشـاییەکی داگیر نەکردووە، بوونـی نییـە؟ یـان هەمـوو ئەوانـەی بۆشـاییەکیان داگیـر کـردووە، بوونیـان هەیـە؟»

«ئایـا بـاوەڕت بـەوە هەیـە، کـە هەمـوو نەبوونێـک لـە بوونێکـەوە هاتـووە؟»

تێناگەیـت، وایـە؟ بـۆ نموونـە، ڕۆح، شـتێک (نازانـم وشـەی شـتێکە تـا چەنـد ڕاسـتە بـۆ ڕۆح بـەکاری بهێنـم)، شـتێک نییـە بەرجەسـتە بێـت و شـوێنێکی لـە بۆشـاییدا داگیـر کردبێـت، لەگـەڵ ئەوەشـدا، سـەرچاوەی جووڵـە و هەناسـە و هەمـوو شـتێکی تۆیـە، بـەڵام خـۆی بەرجەستە نییەو بوونـی نییـە. گەورەتریـن پسـپۆڕ یـان پزیشـک ناتوانێـت شـوێنی ڕۆح لـە جەسـتەدا دیـاری بـکات.

هەرگیـز بینیوتـە ڕۆژێـک پزیشـکێک نەشـتەرگەریی ڕۆح بـکات؟ یـان قـەت بیسـتووتە کەسـێک بڵێت ڕۆحـم دەیەشـێت؟ مەبەسـتمە بڵێـم، کاتێک دەڵێیـن هەمـوو نەبوونێـک لـە بوونـەوە هاتـووە، ئەوەیـە کـە ڕۆح بوونی

نییە، بەڵام هێزێک لە سەروو ئەوەوە بوونی هەیە، کە ئەوی لێ هاتوتە بوون و دروستکەری ئەوە. ئەگەر باوەڕمان وا بێت کە ئەو هێزە نادیارە خودایەکە، کەواتە دەبێت بڕوامان بە هێزێکی باڵاتر و بەهێزتریش هەبێت، کە خودی خودای دروست کردووە و هێناوەتە بوون. لە وەها حاڵێکیشدا، ئێمە دەبین بە خاوەنی زیاتر لە خودایەک و دەبێت بڕوامان بە فرەییی خودا هەبێت.

دەزانی، من هەمیشە بیر لەوە دەکەمەوە، ئەو هێزە چییە کە دەتوانێت کۆنترۆڵی هەموو بوون بکات؟ بۆ نموونە، بەهار هەمیشە بەهارە، زستانیش هەمیشە زستان، چ هێزێکە هیچ هەڵە ناکات لەوەی هاوین ببێت بە زستان؟ یان هەمیشە کرم هەر کرمە، پشیلە ملێکی درێژی نییە، تۆ هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان بە دەنگی مانگایەک قسە ناکەیت. بیر لەوە بکەرەوە، ڕۆژێک مرۆڤەکانی دەوروبەرت دەنگی ئاژەڵ وەربگرن، چی دەکەیت؟ هەڵبەت سەرت سووڕ دەمێنێ، گەر ببینی دەوروبەرت دەنگی ئاژەڵ وەربگرن. ڕاستەوخۆ لەو کاتەدا بیر لەوە دەکەیتەوە، چی وای کردووە ئەمانە وایان لێ بێت؟ چ ناتەواوییەک دروست بووە؟ هۆکار چییە و کێ وای لێ کردون؟ بەڵام ئایا هەرگیز ڕۆژێک لە خۆتت پرسیوە چی و کێ وا دەکات بەبێ بوونی هەڵە، هەموو دەنگەکان و هەموو شتەکان لە جێی خۆیاندا بن؟ بۆچی خۆر نابینی لە شەودا هەڵبێت؟ ئەم هەموو یاسا و پابەندبوونە چین لە گەردووندا هەن؟ کێ دەیانبات بەڕێوە و کێ کۆنترۆڵیان دەکات؟ کێ سەرەمێکوتەی لە ئاوێکدا دروست کرد؟ کێیە لە نەبوون بوون دروست دەکات، نازیندوو دەکات بە زیندەوەر؟ بۆ نموونە، برنجێکی کوڵاو بخەرە عەلاگەیەکەوە و دوو ڕۆژ دایبنێ، دەبینیت دواتر برنجەکە دەبێت بە کرمی ورد و سپی و دێتە ڕیزی زیندەوەرانەوە. تۆ ئێستا دەڵێیت ئەوە برنجەکەیە، کە توخمی خۆی

گۆڕیوە، بەڵام ئەی چی ڕۆحی پێ بەخشی؟ دیسان دەکرێت بپرسین ئایا ماددەیەکی بنەڕەتی هەیە، کە هەموو بوونی لێ پێک بێت؟ ئایا دەکرێت بوونی هەموو ئەمانە بە خودایەکەوە گرێ بدەین؟ ئەگەر باوەڕمان بەوە هەبێت هەموو نەبوونێک لە بوونێکەوە هاتووە، ئەی بوونی خودایەک چی؟ ئایا ئەویش لە بوونێکی ترەوە هاتووە؟ ئەمانە ئەو پرسیارانەن، کە لە تەمەنی دوانزە ساڵییەوە منیان بەقووڵی خستۆتە گێژاوەوە و تا ئێستاش بێوەڵامم.

من ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە و لەگەڵ بوون و نەبوونی خودایەکدا لە گوماندام. بەڵام دەکرێت هەموو شتێکیش گریمانەکراو بێت، یان هەموو بوونەکان سەرەتا گریمانەیەک بووبن، وەک چۆن ئەو ڕۆژەی کە چووم بۆ لای خانمی پزیشک و پێش پشکنینەکە تۆ تەنیا گریمانەیەک بویت و لە هەمان کاتیشدا بوونت هەبوو. ڕەنگە خودا لە ڕۆحدا بوونی خۆیمان بۆ بسەلمێنێ و لەو ڕێگەیەوە پێمان بڵێت من هەم، بەڵام بەرجەستە نیم، وەک چۆن ڕۆحی ئێوە جڵەوی هەموو جووڵە و بوونی ئێوەی بە دەستەوەیە، بەڵام بەرجەستە نییە. دوریش نییە خودا بەرجەستە بێت، ڕەنگە گەردوون جەستەی خودا بێت و ئێمە لەناو ئەودا بژین.

مرۆڤ بەرامبەر ئەم پرسیار و گریمانانە وەکوو کۆترێکی برینداری لێ دێت.

لە هەر حاڵێکدا، پێویستە ئێمە سوپاسگوزاری هەموو ئەو شتانە بین، کە گەردوونی ئێمە و جیهانی ئێمەی لێ پێک هاتووە و دەوریان تەنیوین بە جوانی، وەکوو بوونی خۆر، مانگ، ئاسمان، دەریا، فڕین... هتد. ئاسان و تەنیا وەکوو وشە تەماشای ئەم شتانە مەکە، بەڵکوو بەقووڵی بەریان بکەوە، وەک ئەوەی یەکەمین جارت بێ بیانبینی لێیان ورد بەرەوە و وەکوو خۆیان جوانییەکانیان وەربگرە و درکیان

میچ

پێ بکە، ئازیزترین. هەموو ئەم شتانە مایەی تێرامانن، ئێمە ئێستا هەلی ئەوەمان هەیە، بەوردی لێیان بڕوانین. ڕەنگە لە دەرەوەی ئەم جیهانەی ئێمە، لە دەرەوەی ئەم ژیانە، ئەو هەلەمان نەبێت. مەبەستمە بڵێم، لە دەرەوەی ژیان، ڕەنگە خۆرێک، مانگێک، گوڵێک، بوونی نەبێت، مرۆڤێک بە ڕێگەدا نەڕوات، منداڵێک نەگری. ئێرە چەندین جار بەرامبەر ئازارەکان چێژیشی تێدایە، بەڵام ڕەنگە ئێمە درکی پێ نەکەین. هەر ئەوەی من ئێوەم هەیە و بیر لەقژی لوولی خوشکەکەت دەکەمەوە، بۆخۆی چێژێکی گەورەیە.

ئەوەندە دەزانم، ئەگەر خودا بوونیشی هەبێت، ئەوا خودایەکی عەدالەت نییە. ناتوانم باوەڕ بکەم خودا بوون و دەسەڵاتی هەیە، کاتێک ٥٠٠٠ مرۆڤ لە یەک کاتدا بە ناشرینترین شێوە لە ژیان دەکرێنە دەرەوە و ڕۆحیان بۆ ئاسمان دەچێت. دەبێ لەو کاتەدا ئاسمان چەند ئیزدیحام و قەرەباڵغ بووبێت بە ڕۆح، ڕۆحی کوردەکان، یان کاتێک ژنێک ئەتک دەکرێت، کچێک بە دەستی کۆمەڵێک پیاو بە بلۆک دەکوژرێت. مرۆڤانێک لە برساندا دەمرن و مرۆڤانێکیش قاپی خواردنەکانیان زێڕە. دادپەروەری لەکوێدایە؟

خاڵۆزاکەت بە تەواونەکراوی هاتە ژیانەوە. بۆچی خودا پەنجەکانی بۆ دروست نەکرد؟ بیری چوو؟ دەبوو لەو کاتەدا لە بیری ئەوەشدا بووایە، کە لە کاتی نوێژکردندا چۆن پەنجەی شایەتمانی هەڵببڕێت. کە لەدایک بوو، من زۆر گریام، دایکم و ژنە سەرپۆشلەسەرەکانی نەخۆشخانە ئابلووقەیان دابووم و هەوڵی هێورکردنەوەیان دەدام، دەیانوت ئیشی خودا چەند جوانە. چەند مانگێک دواتر، دایکیشی بوو بە تەم و بۆ لای خودا چوو. لە پرسەکەیدا ژنان بەدەم تەسبیحبادان و فاسۆلیاخواردنەوە دەیانوت، ماشەڵڵا، کاری خودا چەند جوانە!

هەر بەراست تۆش پێت وایە ئەمە کارێکی جوانە؟

رامین، ئەگەر توانیت بەدوای حەقیقەتی ئەم بابەتەدا بگەڕێ و منیش یەکلا بکەرەوە لەم بابەتەدا، چونکە منیش هێشتا بە ڕاست و دروستیی ئەم بابەتە نەگەیشتووم و لەنێوان ئەگەر و گریمانەکاندا گیر ماوم. تۆ ئەگەر توانیت ئاشنام بکە بە حەقیقەت، چونکە دواجار حەقیقەت هەرچییەک بێت و سەر بە هەر گروپ و ئایدیایەک بێت، قبوولکراوە.

# ٣١

دڵۆپەی ئاوی دەستشۆرەکە نایەڵێت بنوم. جێگەی بەتاڵی ئێوە لە تەنیشتمەوە نیگەرانم دەکات. شەوی سەد جار خەبەرم دەبێتەوە و هەست دەکەم سەرماتانە و دمەوێت داتان بپۆشم. سەرما باوەشی پێدا کردووم، زستانێک لە دڵ و ناخمدایە، ترسێکی کوشندەم بە خۆمدا داوە. ئەوەی لەژێر سەرمدایە، پشتی نییە، پشتی ڕەقی کیسەڵێکە. ئەوەی لە ژێرمدایە، چەرپا نییە، جۆرێکە لەتابووتێکی مۆدێرن. باران تەمی سەر پەنجەرەکەی لستەوە. شەو لە نەخۆشێکی سەر جێگە دەچێت. بیرۆکەی ئەوەم هەیە، بتانڕفێنم بۆ دوورترین سەر زەمین، بەڵام کام سەر زەمین؟

هاوڕێکانی باوکت وەکوو پشیلە دەوریان داوم، وەک ئەوەی بۆنی پارچەیەک گۆشتی چەوریان کردبێت.

تۆ هەرگیز بیری کەسێکت کردووە، کە لە تەنیشتتەوە بووبێ؟ هەندێک جار زۆر بیری باوکتم دەکرد، لە کاتێکدا لە تەنیشتمەوە بوو، چونکە هەستم دەکرد زۆر لێم دوور کەوتۆتەوە، تەنانەت لە خودی خۆشی دابڕاوە.

ناتوانم هەنگاوێک بنێم، هەموو شتێک بەستوویەتی، ژیان زۆر سارده. ئەمشەو غەریبانە دڵم تەنگە. هەست بە وزەی لەشم دەکەم پەنگ

دەخواتــەوە.

هەڵدەسـتم ئـاوی دەستشـۆرەکە بەباشـی بگرمـەوە. لـە پەنجەرەکـەوە سـەیری خـوارەوە دەکـەم، مـام نـوری پەردەکـەی لا داوە و گڵۆپەکـەی هەڵکراوە. تەشـت و مەنجـەڵ و پـەرداغ لـە ناوەڕاسـتی ژوورەکەیدا دەبینم. ژوورەکەی مـام نـوری دڵۆپـە دەکات، دەستشـۆرەکە دڵۆپـە دەکات، دڵـی مـن دڵۆپـە دەکات، لووتـی پشـیلەکەش.

ژیـان، لـەم پەنجەرەیـەوە بەشـی ڕژانێـک مەسـتبوونم بـەرێ، لێگـەڕێ پاییز لەبەر بکـەم و بـەم هەمـوو ڕەنگـی مردنـەوە لـەم ئاسمانانەدا بـەدوای فڕیندا بگەڕێـم. ژیـان، لـەم پەنجەرەیـەوە فراوانـی دونیـام پیشـان بـدە، کـە دڵنیـام لـە چوارچێوەی پەنجەرەکـە زیاتـر نییـە.

ڕامیـن، مـن هەرگیـز لـە هێنانەدونیـای تـۆ و خوشـکەکەت پەشـیمان نیـم، چونکـە ئەگـەر ئێـوە نەبوونایـە، هەرگیـز تامـی ئـازاری ڕاسـتەقینەم نەدەچەشت. منیش لەو کەسـانەم، پێم وایـە مرۆڤ لـە ژیاندا دەبێت هەموو تاقیکردنەوەیەکـی هەبێـت.

ناتوانـم بنـووم، وێنـەکان دەر دەهێنـم، ئـەو وێنانـەی خۆزگـە بـە سـاتی گرتنیـان دەخـوازم. هەندێـک جـار حـەز دەکـەم ژیـان لـە کاتـی وێنەکانـدا بوەستایە. لە وێنەیەکدا زۆر بچکۆلەیت و لە باوەشمدا تەماشـای نێو چاوم دەکەیـت. بـە دەسـتی ڕاسـتم دەسـتی چەپتـم گرتـووە و منیـش بـە هەمـان شـێوە تەماشـای چاوەکانت دەکـەم، کە بەرینتـرن لـە دونیا و تێیاندا هەزاران ئومێـد دەخوێنمـەوە. ئـەی تـۆ لەوێـدا چـی لـە چـاوی منـدا دەخوێنیتـەوە؟ بۆچـی بەقووڵـی تەماشـام دەکەیت؟ لـە وێنەیەکـی تـردا نیسـکافەکەی خۆمـم داناوە و نیسـکافە بۆ تۆ سـارد دەکەمـەوە، ئەوەنـدە فووم لـە نیسـکافە کرد، ڕەنگـم زەرد بـوو، ئەوەنـدە فـووم لـە کـوورەی حـەزی گەیشـتن-بە-ئێوە کرد، دەرفـەت نەمـا نیسـکافەکەی خـۆم بخۆمـەوە و ژیان لـە دەسـتی کەوتـە

خوارەوە و کوپەکەم شکا.

لە وێنەیەکی تردا، کێکی ساڵیادی لەدایکبوونی سێهەم ساڵت قاژ دەکەم. تۆ بە پەنجە کرێمی کێکەکە دەخۆیت. من پێکەوەبوونمانم لەگەڵ کێکەدا قاژ کرد و بووین بە چوار پارچەوە.

ناتوانم بەردەوام بم، دڵم بۆ ساتی گرتنی وێنەکان تەنگ بووە. لە داخا بنێشتێک دەهێنم و هەتا هێزم تێدایە ژیان دەجووم، لەناکاو پارچەیەکی لە دەمم دەر دەهێنم، ڕای دەکێشم و دەیبەمەوە ناو دەمم. پاڵ دەکەوم و مەراق دەجووم. کاتژمێرەکە ملی خوار کردۆتەوە، ترپەی دڵی نایەڵێت کەس بنوێت.

لە دەنگی نانەوردەی کۆڵانەکە خەبەرم دەبێتەوە. قژم نووساوە بە پشتییەکەمەوە. بە پشتییەکەوە دەچمە خوارەوە.

«ئەنە بنێشت بە قژمەوە نووساوە، بۆم ببڕە.»

«هار بوویت نیوەشەو بنێشت دەجوویت؟»

«ئاخخ... بەسووکی، وریا بە، زۆر قژم نەبڕیت، بەشی ئەوەی پێوە بهێڵێت پیاوێک کڵاوەکەیم بۆ دانەوێنێت»

# ٣٢

پەنجەرەکە دەکەمەوە، هەوای ڕۆژێکی نوێ بەرەو ڕووم دێت.

درۆ دەکەم، هەوا چی دەکات لێرە؟ هەوا تەنیا لای هەناسەکانی ئێوە بوونی هەیە. دوێنێ بەتەنیشت باخەکەی ماڵی نەنکتدا چووم بۆ سەر دەریا، ئێوەم نەبینی لە باخەکەدا، ڕەنگە تۆ لە قوتابخانە بووبی و هانیکۆش لە ئاوێنەکاندا بۆ دایکێک گەڕابێت. لەسەر دەریا نەورەسەکانم بینی، هەندێکیان نیشتبوونەوە، پڕ بە چنگم لمم هەڵگرت و تێم گرتن، تا نیشتنەوەیان نەبینم و هەمیشە بفڕن. گوناهە بە جووتێک باڵەوە بنیشیتەوە و نەفڕیت.

ڕامین، لە ئازاردام، چونکە ناتوانم بتانبینم، لە ئازاردام، چونکە ناتوانم بێمە لاتان، ئەو ساتانەیشی دەتانبینم، هەر لە ئازاردام، چونکە دەبینم بە هۆی منەوە ئازار دەکێشن، یاخود مەزەندەی ئەو کاتە دەکەم، کە دووبارە جێم دەهێڵن.

ئومێدی گەورەبوونتان بە پێوە دەمهێڵێتەوە.

شاعیرەکەی هاوڕێم دڵنیای کردمەوە لەوەی کاتێک گەورە دەبن، بە ڕاکردن دێنەوە ناو ژیانم، دڵم بەم قسەیە خۆشە، هەرچەندە دەکرێت تەنیا گریمانەیەک بێت، بەڵام لە وەها حاڵێکدا ناچارم دڵ بە گریمانەکان خۆش کەم.

دڵ خۆش دەکەم بەوەی زۆریک دێت پێکەوە قۆڵ دەکەین بە قۆڵی ژیاندا و چوارقۆڵی پاشماوەی شەقامەکە دەبڕین، هەرچەندە هیچ سەقفێک لەسەر خەیاڵ ڕاناوەستێت.

ئێستا دابونەریت دەیەوێت بە نینۆکەکانی شوختم تێ بکات، منیش دەمەوێت جڕتێک بکێشکم بۆ قسەی قۆڕی کۆمەڵگە. ئەگەر هەزار دەستم هەبێت، هەزار کەلەبچە بوونی هەیە. دەمەوێت کلیلی کەلەبچەکان بدۆزمەوە، یاخود بیر لە چۆنیەتی شکاندنیان بکەمەوە، یان ئەوەندە بەهێز بم، نەیەڵم بکرێنە دەستم. من بەردەوام لە شەڕێکی گەورەدا بووم بۆ بەدەستهێنانەوەی ئێوە، بەردەوامیشی پێ دەدەم، قەڵغانەکەی دەستم گوللەبڕە.

ئێستا لە دووریی ئێوە باخچەکەم پڕ بووە لە پشیلە و کەروێشک و نووتەلە، ژوورەکەم زیندانی ئینجانەیە.

بیری منداڵیتان دەکەم، منداڵیتان، کە خەریکە لێم دوور دەکەوێتەوە. ئێستا دەمەوێت نامەیەک بۆ منداڵیتان بنێرم و تێیدا گلەییی گەورەبوونتانی لێ بکەم. ئێستا دەمەوێت تۆپە خڕەکەی سەر مێزەکەی خانمی دکتۆر بسووڕێنم و کات بگەڕێنمەوە.

پێیان وتووم ئێستا پرسیاری ڕەنگی قژم دەکەیت، ئایا ڕەنگی قژی دایکت بیر چۆتەوە؟ بەڵێ، دەزانم بیرت چۆتەوە و دەتەوێت لەوە زیاتر لە یادەوەریتدا کاڵ نەبێتەوە. ڕەنگی قژم لە ئێستادا ڕەشە، بەڵام پێدەچێت کاتێک تۆ ئەم دێڕانە دەخوێنیتەوە، تاڵی سپیی تێ بکەوێت، کێ دەزانێت؟

لەسەر دەریا دەنگی تۆ و هانیکۆ دەبیستم تێکەڵ بە دەنگە ناخۆشەکانی ژیان دەبێت، دەتوانم لەنێو سەدان دەنگی تردا بیانناسمەوە، دەیانناسمەوە لەنێو دەنگی بە لەمێکی کۆندا، لەنێو دەنگی گیزەگیزی سەماوەرەکەدا، دەنگی باپیرت، ئەو کاتەی گوڵەکانی دەشکێن، دەنگی غەمگینی دایکم

لە پەنجەرەکەدا، دەنگی نێرینەی ئایین، دەنگی ئاگراوی کچە عاشقەکانی گەڕەک، دەنگی تێپەڕینی زەمەن بەلای پەنجەرەکەدا، بەڵێ، دەتوانم دەنگی ئێوە جیا بکەمەوە.

«دایکە، دەریا هێمنییەکی سەیری هەیە، هانیکۆ، وێنەکانم مەشێوێنە، کاکە، دەستم بگرە با نەکەوم، دایکە، لە ئاوەکە وەرە دەرەوە، نەبادا ژیان بتخنکێنێت، کاکە، کەرویشکەکەم بۆ بگرە، دایکە، پەشمەکەکەم لێ دەسێنن.»

پڕ بە گەرووم دەقیژێنم و بانگتان دەکەم، بەتیژی گوێم لە دەنگدانەوە و زایەڵەی دەنگی خۆمە.

بێزارم لە دەنگە ڕەقەکانی ژیان.

نەنکت هەمیشە دەڵێت، لێگەڕێ با ژیان وەکوو خۆی بڕوات، بەڵام من نامەوێت ژیان وەکوو خۆی بڕوات، بەردەوام دەستکاری دەکەم، ڕەنگە هەر ئەمەش بووبێتە هۆی سەرلێشێواویی من.

هەست بە ساردیی ئاوەکە و تەزیویی ژیان دەکەم.

من و باوکت ئێستا دانی پێدا دەنێین، کە دەتوانین تەنیا هاوڕێ بین، باوکت ئەو پیاوەی دەستەکانی جوانن، من ڕێوشوێنی بۆ دادەنێم هاوسەرگیری ژمارە دوو، ئەویش ڕێنوێنیم دەکات ژنێکی گوێڕایەڵ بم بۆ مێردی ژمارە دووم، تۆش لە باخەکەدا، ئاخخخ! تۆش لە باخەکەدا وێنەی چوار ئەستێرە دەکێشیت لە نزیکی یەک.

هەمیشە دایکم بینیوە هەر دایک بووە، دەمەوێت وێنای ئەوە بکەم، کە ڕۆژێک کچێکی دڵتەڕ و عاشق بووە، بەڵام ناتوانم.

پێم وا بوو پاش ئێوە، ئەوەندە بە زەوییەوە نامێنمەوە، بەڵام مامەوە.

من لە شارێک دەچم دوای جەنگ، پیاوەکانی دەورووبەرم ئەم وێرانەیە درک ناکەن، هەر بۆیە زوو عاشقی جووتێک چاو و تەسبیحی قەزوانی مەچەکم دەبن، ئەوان توانای خوێندنەوەی ئەودیوی چاوەکانیان نییە، ئەوان

تەنیا پێکەنینی لێوەکان دەبینن و توانای بینینی بریقەی چاویان نییە، کە بە هۆی فرمێسکێکی شاراوەوە دروست بووە.

ئەو چاوانەی غەدری ڕۆژگار بەرینتری کردوون، ئەو چاوانەی دونیا وەک خۆی دەبینن، ئەو دونیا بەرینەی لە جووتێک چاودا جێگەی دەبێتەوە.

بیر لەوە دەکەمەوە، ڕۆژێک لەپڕێکدا دەمرم و فریای چاککردنی قەدی نوشتاوەی لاپەڕەی کتێبەکان ناکەوم، فریای دڕاندن و فڕێدانی دەفتەری ئاڵۆزی تێبینییەکان ناکەوم. فریای لێکردنەوەی ئەو بنێشتانە ناکەوم، کە شەوان ئەیاننووسێنم بە قەراغی چەرپاکەمەوە.

حەزم لەو ماڵانەیە، کە گوڵدانیان لە باڵکۆنی ماڵەکانیاندا داناوە و ژن و پیاوێک تێیدا شەیدای یەکن.

نیگەرانم لەوەی کارەساتی گەورە ناتوانێت مرۆڤ بوەستێنێت و بەتوندی بەر خۆی بکەوێت.

نیگەرانم لەوەی کارەساتی مرۆیی، فۆرمی کارەساتی سروشتی وەرگرتووە.

بیری منداڵیم دەکەم، هەمیشە کە بیری منداڵیم دەکەم، دەچمەوە خانووەکەی چوارباخ، دەبینم بووە بە باڵەخانە و ناتوانم جێپێکانم و چاڵی موورمووروێنەکەم و خەتەکانی خەتخەتێنمی تێدا بدۆزمەوە، ناچارم پەنا بۆ جێگەیەکی تر بەرم بۆ دۆزینەوە و گەڕانەوەی منداڵی.

حەزم لە خەتخەتێنە و دایکم ڕۆژێک تا ئێوارە، لە دوازدە ساڵییەوە تا جەهەنەم بە تاوانی هەڵبەزینەوە و بەرزبوونەوە و لەرینەوەی مەمکم دەرگام لێ دادەخات.

وایییی! گەورەبوون، چ وێرانەیەکیت. هێشتا زۆرم مابوو لە نێوانی خەتەکاندا هەڵبەزمەوە و بەرد هەڵبدەم.

زۆرم مابوو دەستی ئەو کوڕانە بگرم، کە هۆکاری دەستگرتنمان تەنیا

فیکلانکۆ بوو و هۆکاری ناوقەد گرتنمان تەنیا قیتار قیتارێن بوو.

ئێستا لە نێوانی خەتەکاندا خۆمم لێ ون بووە، بە دڵێکی بیمارەوە لەنێو خەتەکانی خەتخەتێن و خەتەکانی نووسیندا بۆ خۆم دەگەڕێم.

کە منداڵ بووم، سەرم بۆ بینینی شتەکان بەرز دەکردەوە، ئێستا شتەکان سەر هەڵدەبڕن بۆ بینینی من و من سەر دادەنوێنم، زەوی زۆر بچووکە و من دەمەوێ بفڕم.

دەمەوێت بەتەواوی بڕوامەوە پێت بڵێم:

"چەند بچووکە گەورەبوون!"

تاڵەکانی پەرچەمم نایەڵن دەریا وەکوو خۆی ببینم، دیمەنی جوانی دەریا شادم ناکات. هەردوو دەستم دەکەمە گیرفانی دواوەی پانتۆڵەکەم، سەر دادەنەوێنم و سەیری لمەکە دەکەم، سەیری پێیەکانم دەکەم، کە لەچاو منداڵیمدا، چەند گەورە بوون. بیر دەکەمەوە، ڕەنگە پەنجەی پێیەکانم هی نەفر تی تی بن، یان هی فروغی فروغزاد، کێ دەزانێ؟

دەمەوێت بچمە نێو بەلەمە کاغەزییەکەی تۆوە و سەفەری گەورە بکەم، بەڵام سەفەر بۆ کوێ؟ دواجار هەمووومان لەناو بازنەیەکی داخراودا دەسووڕێینەوە، هەمووومان لەناو تۆپە خڕەکەدا خول دەخۆین. سەفەری گەورە بەناو خۆمدا دەکەم، بەناو خۆمدا.

بە نووکی پەنجەگەورەکەی پێم وێنەی شتێک دەکێشم، وەکوو چاوەڕوانی، یان شتێک، ئاماژە بێت بۆ چاوەڕوانی، دەیسڕمەوە، دووبارە بە گەورەیی لەسەر لمەکە دەنووسم:

**هیچ!**

